ناوی کتێب: لەچاوەڕوانی پیاوێکدا

بابەت: شیعر

هۆنراوەی: ژوان ئاوارە

مۆتیف: ئیسماعیل عومەر

نەخشەسازیو دەرهێنانی هونەری: رۆژدیزاین

چاپ: چاپخانەی دەزگای ناوەندی راگەیاندن

تیراژ: 500

لە بڵاوکراوەکانی مەکتەبی ناوەندی راگەیاندنی یەکێتی نیشتمانی کوردستان ( 46 )

کومەڵە شیعری

# لە چاوەڕوانی پیاوێکدا

سلێمانی- فەڕەنسا

2005-2002

(ئەم کۆمەڵە شیعرە پێکهاتووە لە دوو هەناسە کە بەرهەمی چوار ساڵە لەنووسینی من، هەناسەی یەکەم ئەو دەقانەن کە لە سلێمانی نووسراون، هەناسەی دووەم ئەو دەقانەن کە لە تاراوگە نووسراون)

ژووان ئاواره

بۆ (روئیاو ئەلیزا)




# هەناسەی یەکەم

## سەرجەمی ئەو تێکستانەی کە لەسلێمانی نووسراون

## لەچاوەڕوانی پیاوێکدا

– بە لێوی ئێوارەیەکەوە لەدایکبوو کە مانایەك نەمابوویەوە بۆ عەشق، نیگایەك نەمابوویەوە بۆ ڕاوکردنی جوانی، بانگەشە غەریبە بۆ تیلاوەتی بێدەنگیەکانمان و ڕاکشانە لەبالیفی ڕوئیەتەکانی یەکترا، تەسویرێکی نهێنی ئەو ئەدگارانەیە کە لە چاوەڕوانی دەنگێکدان بۆ ساتێك ئۆخژنبوونەوە.
ماڵێکی شووشەییە بۆ ئەو چۆلەکانەی دەیانەوێ دوور لەپێکەنینی تفەنگەکان بەڕووتی سەمابکەن،
کتێبێکی بێدەنگە لێوان لەحیکایەتی ئاڵتونی
گردکردنەوەی گازەندەی ئەو ئاسکە غەمگینانەیە کە بە عەشقەوە لە نهۆمەکانی نائومێدیدا چاوەڕوانی گەڕانەوەی پیاوێکە کە هاتەوە بەقامچیەکەی بڵێ:
(بمبوورە لەگەڵم ناتبەمەوە ماڵێ)



من دەمێکە ماتڵی تۆم
لەودیو وەرزە ئاڵەکانی بێدەنگیمەوە
لەودیو پێگرتنی نائومێدیەکانمەوە
لەژێر گوێسەبانەی ئێوارە پیرەکانی تەنهاییمداو
لەکەنار تووتڕکی زەمەنە ساختەچیەکاندا
بەتەنیشت سپێدە لەزوڵمەت خوڵقاوەکانی کەوندا و
لەپشت هەناسەبڕکێی کتێبە داخراوەکانی ویژدانەوە
بەم هەمووە تاریکیەوە لەدایك بووم
بەم هەمووە تاریکیەوە هاتم و
بەم هەمووە تاریکیەوە ئەڕۆم!!
بەکۆڕانی ئومێدە شێن هەڵگەڕاوەکانی نەستمەوە
بەم دەقە بێ دەمامکەی نیگامەوە
بەم چەترە لەتەم چنراوەی ئایندەمەوە
لەژێر لێزمەی ئەم بارانە لەغوربەت باریوەی ئیحساسما
ماتڵی تۆم،
ماتڵی تۆم ئەی ئەو پیاوەی هەر شەوە شەمعێکم پێ ئەسوتێنی و هەر نایەی!
هەر وەرزە نیگایەکم ئەدزیت و دیار نیت!
ئەتوانی بەهێما پەنجەرە داخراوەکانی (نەوتن) بکەیتەوەو
وازی لەگەڵ کوختیەکانی (وتن) دابکەی!
ئەتوانی لەسێڵاوەکانی مروەتدا دووڕەکانی حەقیقەت

ڕاو بکەیت و لەلەپی گومانەکاندا بیشاریتەوە!
ئەتوانی دەرگاکانی بیستن
لەسەر ئەم ئاوازە غەریبانەی شعورم بخەیتە سەر پشت و
لەسەر ئەم کورسیە قەلەقەی ئیرادەم
ڕۆژنامەکانی بێ باکی بخوێنیتەوەو
جگەرەی بێهودەیی بکێشی،
قاقای ئەم منالە چارشێو پۆشەی ناخم نەتخاتە پێکەنین!
بروانە پرتەقالی ئەو عومرە هەڕاجکراوانەم
من دڵم پێم ئەڵێ
تۆ هەر شەوە لەچاوی عیشقێکی سەرەڕۆدا ئەخەویت و
هەر ڕۆژە هەڵەیە لەهەڵەکانی موحیبەت ئەنوسیتەوە.
ببوورە ئەرێ مووحیبەت لەئەزەلەوە هەڵەیەکی جوان بوو
یاخوود حەقیقەتێك لێوان لەخواستی ئیلاهی!!
ئەرێ موحییبەت هەر کرماندنی سێوێك بوو لەبازاڕەکانی لەزەتا
یاخود بێ ئەمەل بوونمان بوو
لەگەیاندن بەیەکی ڕاستەهێڵەکان
هاوڕێ شاعیرەکەم،
دوای تەکاندنی دەستەکانی لەکایەکانی دۆڕاندنی موحیبەتا
بەمەغریبەکانی تەنهایی ئاشنا بوو
وەلێ ئەوان بۆ هەلاتن لەتەنهایی موحیبەتیان دۆزییەوە
لەوەتەی هەین لەم فارگۆنە تاریکەداین



هەر بەیەکەوە گوناه ئەکەین و پێکەوەش پەشیمان ئەبینەوە!
تۆ لەحەسارەکەی (کەیکاوس)و
من لەحەرەمەکەی (زولێخا)
تۆ لەسەحرا برنگەکانی شێت بووداو
من لەمێرگەکانی(عامر شا)
تۆ لەسەر دوا ڕەخشی میرایەتی و
منیش لەکەژاوە ئاوریشمیەکانی (زین)دا
بیر لەگەیشتنی تۆ ئەکەمەوە
بیر ئەکەمەوەو پایپەکەم پێ ئەکەم
بیر ئەکەمەوەو عەشق ئەکێشم!
بیر ئەکەمەوەو کچە قۆشمەچییەکانی هاوڕێم پێم ئەڵێن:
(یاریکە ئەی جوانترین دەبەنگ لەکایەکانی ئەم دنیایەدا
بەدۆڕاوی ئەمێنیتەوە)
بیر ئەکەمەوەو مژۆڵەکانی جەحێلیم سپی ئەبێ!!
بیر ئەکەمەوەو پەنجەرەی بینایەکانم تەم ئەیگرێ!
(مەم)ی ئەم بێهودەییە بۆ نەهات؟
(فەرهاد)ی ئەم فەرتەنەیە بۆ نەگەیشت
من خەیلێکە ماتڵی تۆم
ئەی پیاوێك ئەتوانی
لەئەدگاری ئاوێنە تەماوییەکانی بیرچوونەوەدا
هەناسەی شپرزەیی ئەم ئێوارانە بنووسیتەوەو

ئاسکی ئەم نیگەرانیە ڕاو بکەیت،
تۆ کە ئەزانی من دڵم وەك خیابانێکی تەنیا
سینەی بۆ پاژنە قوڕاویەکانی ئارەزووت ڕائەخات
ئەم پیاسەیە بۆ ناکەیت؟!
ئەم پیاسەیە بۆ ناکەیت و پێکی ئەم حەسرەتە بۆ ناخۆیتەوە؟
کەروێشکەکانی ڕۆحم
لەدەمی ئەم ڕێوییە سیاسیانەی میحنەت بۆ ناهێنیتە دەرێ؟
خەونی تولانی ئەم چاوەڕوانییەی جەستەم بۆ نازڕێنی؟
ئەزانی من هەندێ جار بەدەم تای نیگەرانیەکانمەوە
پێکەنینم بەم وڕێنە بێ سەوداییانەی خۆم دێ!
نیگەرانم و(مەسیح)ی ئەم موحیبەتە دانابەزێ
(مەهدی) ئەم چاوەڕوانییە ناگا..
من سەربووردەی ئەفسانەکانی تۆو
خەیاڵە بێ خەوشەکانی زاکیرەم لەیادە
ئەو کاتانەی تۆ وازیت بەتەسبیحەکانی بەختەوەری ئەکرد
من ملوانکەی فرمێسکی ئەو قەیرە کچانەم ئەهۆنییەوەو
بەگومانەوە پێم دەگوتن:
وەرنە ژێر شەبەنگی چاوەڕوانیەکانمەوە
من دەڵێم:
(مەم)ی ئەم بێهودەییە ئەگا
(فەرهاد)ی ئەم بێستونە دێتەخوار



(مەسیح) ی ئەم موحیبەتە دادەبەزێو
(مەهدی ) ئەم خەرابستانەیە هەڵدێ!
ئەوان بەدەم شیکردنەوەی ئەگریجەکانیانەوە
ئەبرۆکانی مەینەتیان هەڵدەتەکان و
بەپێکەنینێکی بێماناوە ئەیانگووت:
(بەڵام ئەوەلیەتی جەنگەکانمان جەنگی خوڵقاندنی ئەو ئاوێنانە
بوو کە نەمان دەتوانی بیگرینەوە عەورەتی بێدەنگیەکانی یەکتر)
ئەو کاتانەی تۆ واعیزی حەقیقەتە درۆینەکانی خۆت بووی
من شەرمم دەکرد پێت بڵێم:
میرۆ گیان ئەم گومانە زاکیرەم ڕووت ئەکاتەوە
سەرم ئەخوات ئەو قەدەرەی کە پێم ئەڵێ:
(تۆ ئەڵماسێکیت لەبێدەنگی و بێدەنگیەکیت لەبێمانایی)
ببورە من پاش هەموو جەنگەکان بە بەتاڵی ئەگەڕێمەوە!
ئەگەڕێمەوەو ئەگریجەم تەژییە لەگازندەی وەریوو
ئەگەڕێمەوەو ڕەزەکانم بەرسیلەی بێ ئومێدی ئەگرن
ئەگەڕێمەوەو تەرحێکم پێ نییە بۆ ژیان
ئەرێ بەڕاست چکارەین لەسینەی دوکەڵکێشی ئەم زۆرانەدا
کە هەرگیز نایبەینەوەو ئازمایش لەدۆڕانەکانی ناکەین؟!!
میرۆ گیان
ئەزانیت ئەوەڵین جەنگی ئێوارەکانم لەپەنجەرەکانی تۆدا
ئەبینمەوە،

ئەو بەخەیاڵی حەقیقەتێكی سەرخۆشەوە پێمی دەگووت:
تۆ لەبیرەوەری تاریكیەكاندا
بیر لەدۆزینەوەی مەرجانەكانی مەعریفە ئەكەیەوەو
ڕازە گرینۆكەكانی وجود ئەخوێنیتەوە
تۆ لەتونێلە كونینەكانی ئێرادەتدا
شەونامەی گەشتنی پیاوێك ئەنوسیتەوە كە نایەت!
نایەت و لەو دەرگایانەوە ناتباتە ژووریٚ
كە ئەچێتەوە سەر ئایندەی كۆشكە یاقووتیەكانی سەبووری!!
وەرە گەروی حووتەكانی خەیاڵمەوەو
لەسەر بالیفی ئەستێرەكانم خەونی نویٚ ببینەو
لەگەڵ سەدەفەكانمدا بیر بكەرەوە
سەر بنیٚ بەسنگی ناخوداكانمەوەو
لەپرچی بەیانیەكانمدا ڕاكشیٚ
وەك ژنێكی عەیار نیگای پاسەوانە بیٚ مرووەتەكانی ئێوارە بگرە
لەحوزور بەگزادەكانی سبەینێدا ڕووت ڕووت بەرەوە،
ئەوەی لەچاوەڕوانی هاتنی دەنگێكدا
بەدیار ئاوێنە تاریكەكانی بەختیەوە باوێشك ئەدا
گرەوەكانی زیندەگی ناباتەوەو لەو ئەستێركە بۆگەنەدا
یاقووتەكانی ئاسودەگی بۆ ڕاو ناكرێت
نێچیری ئەم سروەتنە ناباتەوە ماڵیٚ
لەژێر شۆڕەبیەكانی عومردا ئەم خەونە گەڕۆكە ناگەیەنێتە كۆتا



تۆ كە ئەزانی پاش جەنگەكان بەدۆڕاوی ئەگەڕێیتەوە
خەوتنت لەپەنا ئەم لوغمی ئومێدانەدا یانی چی؟
ئاوزەنگی دانت بەم مانا وەریوانە چ دەكات؟
ژنە فاڵچیەكەی هاوڕێم
دەستی بۆ كۆترەكان ئەگرتەوەو
نیگاكانی منی ئەخوێندەوەو
بە چیە بۆ نەورەسەكان ئەدواو
پێشـبینی پیربـوونی ئێـوارەكـانمی ئـەكـرد بەهەڵخلیسـكانەكـانم
پێدەكەنی لەسەهۆڵبەندانەكانی مەعریفەدا
ئەو دەیگووت:
هۆ ژنە نەعلەتیەكە
ئەی ئەوەی ئەخوازی لەودیوو تاریكیەكانەوە
پێكەنینی كەناریەكان بژمێری و
بەدیار گەڕانەوەی پیاوێكەوە فلووتی بەردەكان بژەنی
(ژیان جەنگێكی بیٚ مانایە لەوپەڕی گێلیداو
بەختەوەری خەوتنە لەئەگریجەكانی دەبەنگیدا)
ژنە فاڵچیەكەی هاوڕێم
یاری بەئەنگوستیلەی ڕوانینەكانی ئەكردو ئەیگووت:
بەر لەتۆ منیش هەمان گەمەم ئەكرد
سەعیم لەهەمان تەریقەتی میوانداری پیاوێكدا ئەكرد
كە پێم وابوو ئەتوانیٚ حیكمەتی تەنهایی ئەو ژنانە بنوسێتەوە

که لەسەقەرە پیرەکانی فیراقی ئەودا
پەنجەرەکانی ئەمەلیان ئەسڕیەوەو
کۆترە غەمگینەکانی ئایندەیان بەردەدایە ئەم حەوشی مردنەوە
بەر لە تۆ منیش
لەچاوەڕوانی گەڕانەوەی پیاوێکدا
ئەدگاری عیشاکانی نائومێدیم چاوکردو
لەخوانی ئەفسانە درۆینەکاندا
کۆتا لیمۆی ئەم نائومێدیەم لەپەنجەکانمدا بینیەوە
لەبالیفەکانی گریاندا
یەکەمین سەرخەوی ئەم سەفاو مەڕوایەم شکاند
ببوورە هاوڕێ
(ژیان جەنگێکی بێ مانایە لەوپەڕی گێلیداو
بەختەوەری خەوتنە لەئەگریجەکانی دەبەنگیدا)
ژنە فاڵچیەکەی هاوڕێم دەیگووت:
بەر لەتۆ ژنێکی تر لەبەردەم وەرزە ساردەکانی عەشقداو
لەسەر دواهەمین پلیکانەکانی غوربەتدا
لەچاوەڕوانی پیاوێکدا ببوورە لەچاوەڕوانی کەسێکدا
بەر لەوەی گوڵە سپیکانی ئەکاکیا وردبکاو
بەر لەوەی عەورەتی ئەستێرەکان لەنیگاکانی دا زەخرەفە بکات
بەر لەوەی پەنجەرەکانی گوڵە پاتۆنیای شیعر بگرێ
ئەگریجەی لەبیرەوەری تەنهایەکانی هەڵبکێشێ



بەر لەتۆ خانمێکی تر لێوی ڕۆیاکانی کاڵ ئەکردەوەو
بەر لەتۆ ئەو دەیگووت: [1]
(من خەونم دیوە کەسێ دێ
کەسێ دێ
کەسێکی تر
کەسێکی باشتر)
ئەو دەیگووت:
(کەسێ دێ
بەدڵ بەهەناسە
بەدەنگی لەگەڵ ئێمەیە)
بەر لە تۆ بێوەژنێکی شەوپۆش
لە دووڕیانی تەنهاییەکانیدا
بەدەم وەرینی خەونەکانیەوە
عەینەکە لێڵەکانی ئایندەی ئەسڕییەوە
ئەو دەیگووت:
گووشیەکە وا ئەڵێ
تیڤیەکە وا ئەڵێ
خوداو پەیامبەرو ئەولیاکان وا ئەڵێن
پیاوێك دێ سەردەنێ بەسنگی شوو شەییتان و
گمەگمە لەبێدەنگیتان ئەخواتەوە
فوو فوو بوغوردی مەلوولیتان خامۆش ئەکا

ئەو کتێبە داخراوانە ئەکاتەوە
کە لەیەکەمین پەڕەگرافیدا نووسراوە
(تەنهایمان لەئەستۆی تۆدایە
ئەی پیاوێك ناخوازی بگەیە کەنار
ئەی پیاوێك ناتەوێ لەقولاًکاندا بیر بکەیتەوەو
لەودیوو میرنشینەکانی شەهامەتتەوە
ئەم گەمە بگەیەنیتە کۆتا)
ئەی پیاوێك ناتەوێ لەودیوو ئێرەییەکانتەوە
گوڵەباخی ئەم ئیحساسانە بۆن کەیت و
جڵەوی ئەم ڕەخشی تووڕەییە بگری و
بەقامچیەکەو بڵێی:
بمبوورە لەگەڵم ناتبەمەوە ماڵێ
(ژن کتێبێکی نیگەرانە ئەوەی نەیخوێنێتەوە لەحیکایەتە
ئاڵتونیەکانی ناگا)
ژن کەنارییەکی بێدەنگە ئەبێ بەجریوە لەگەڵیدا بکرێیتەوە
ئەوەی لەئەتڵەسە قوڵەکانی عیشقی ژنا مەلە نەکاو
سەر نەنێ بەسنگی ڕۆیەتەکانیەوە
لەکلاسەکانی دا دواهەمین وانەکانی ئەوین نەنووسێتەوە
(ئەم گەمەیە ناگەیەنێتە کۆتا)
ئەوەی لەپەنجەرەکانی ژنەوە نەڕوانێ و
لەحەرەمەکانی عەشقیا



بێریتەی ئەم تەمەنە ساز نەکات
(ئەم گەمەیە ناگەیەنێتە کۆتا)
بەقامچیەکەو بڵێ بمبوورە لەگەڵم ناتبەمەوە ماڵێ
دڵی تۆ تەنگە بە پەنجەکانی من
دەنگی تۆ کورتە بەڕۆیاکانی من،
ئەوان هەڵەیان کرد
ببوورە ئەو شێتانە جگەرەکانی تەنهایی پێ ئەکردو
حول حولیانە بیری ئەکردەوە
ئەوێك کە نەیتوانی تەنها جارێك چاویلکە تەڵخەکانی مەعریفەی
دابگرێ‌و فەلسەفەی ئەم کتێبە نیگەرانە بخوێنێتەوە
ئەوێك کە نەیتوانی
لە زنجە خۆڵاًیەکانی موحیبەتدا
پەنجەرە شکاوەکانی حەقیقەت بکاتەوەو
بەو ئاسکە غەمگینە بڵێ:
بمبوورە من‌و تۆ لەهوتاڤ بەیانیەکدا لەدایك بووین
لێوان لەچڵەکانی بیر چوونەوە
من‌و تۆ لەڕەحمی بەیانیەکی تووڕەوە هاتینەدەرێ‌و
لەهەمان ڕەوڕەوی شیرزەییدا پێمان گرت
ببورە ئاسکە بریندارەکەم،
ئەو دەمانەی بیرمان لەگووشینی پەنجەکانی یەکتری ئەکردەوە
وەرزی قاتی پێکەنین و

ئەی لەبێدەنگی تەنهاترو
وەی لەتەنیای جوانتر
بەو ئاسکە غەمگینەبڵێ:
بمبوورە من سەرم لەچاخە تاریکەکانی عەقڵمداو
چاوم لەتابلۆ قوڕاویەکانی گەورەیمداو
دەستم لەتۆخکردنەوەی جەنگەکاندا بوو
نەم پەرژا بەتەنها ئاوڕێك پێت بڵێم:
بمبوورە ئاسکە غەمگینەکە
بمبوورە.... بمبوورە...بمبوورە
گوشیەکە وا ئەڵێ
تیڤیەکە وا ئەڵێ
مناڵە نەبەکامەکانی شار وا ئەڵێن
خوداو،پەیامبەرو، ئەولیاکان،
وا ئەڵێن:
پیاوێك دێ پەنجەرە لەسەر گۆرانیە حەرامەکان ئەکاتەوە
پەنجەرە لەسەر ئیرادە حەرامەکان ئەکاتەوە
دواهەمین نووسخەی تەنیایی ئەو کچانە چاپ ئەکاتەوە
کە پێیان وابوو
ژیان ماکەوێکی ڕەنگین بوو
بەسەر منارەی مزگەوتەکانەوە
دانەوێڵەکانی چاوەڕوانیان بۆ ڕۆکرد



وەرزی قاتی مەرحەمەت و
وەرزی قاتی حاڵی بوون بوو!
بەو ئاسکە غەمگینە بڵێ:
بمبوورە کە نەمتوانی تەنها جارێك لەگڵێنە ماتەکانی عەشقما
بتشارمەوەو لەسنگی لیخنی ئەم جەلادە پیرەی قەدەر
بتهێنمە دەرێ!
نەمتوانی تەنها جارێك
گوڵە وەریوەکانی ئارەزووت بدەمەوەو
لەنیشتمانە وەنەوشەییەکانی فرینا
ئیرادە ڕژێنراوەکانت کۆکەمەوە
دوور لەشەهوەتی ئەم حەسادەتە پێکەنینەکانت بنوسمەوە
دوور لەم خەرابی غیرەیە
پەنجەلەجێ چووەکانی موحیبەتت بگرمەوە!
بەو ئاسکە غەمگینە بڵێ:
بمبوورە.... بمبوورە... بمبوورە
نەمتوانی تەنها جارێ
چارشێوی پێڵوەکانت هەڵبدەمەوەو
کەناری ئەشکەکانت بدوێنم
نەمتوانی تەنها یەك جار پێت بڵێم:
مەرحەبا ... ئەی جوانتر لەپێکەنینی هەنار
مەرحەبا ... ئەی نازکتر لەخەونە کریستاڵیەکانی ئاورنگ

بەدیار گەڕانەوەی نێرەکەیەوە نیگاکانی داگیرسان
لەسنگی سپێدەیەکا بەگوللەی ئەم حەسادەتە پێکراو
کەس نەیبردەوە ماڵێ!
ئەوان دەیانگووت:
(ژیان نێچیری بەیانیەکەنەفەسێکی تیانیەبۆحاڵی بوون
هەناسەیەکی تیا نیەبۆ ئاشتبوونەوەی دوو پێکەنین
لەمەودای نیشتمانێکی مەلولدا
(ژیان نێچیری ئێوارەیەکە کە ناخوازێ بەو بوونەوەرە غەریبە بڵێ:
ئەزانی هەربەڕاست کتێبێکی بێدەنگ بوویت
کەس نەیتوانی بتخوێنێتەوە)
کەس نەیتوانی لەکانی ڕوانینەکانت گۆزەکانی مەعریفە پڕ بکاو
ڕووت ببێتەوە وەك دڵۆپێ ئاو لەوپەڕی تەهارەتدا!
ژیان نێچیری وەرزێکە مینایەك لەگۆلاوەکانیدا ناڕوێ
بۆ ئەنگوستەکانی (عوزرا)
گوڵێکی بۆ کەزییەی (زین) پێناکەنێ و
خۆی نادا لەسینەی(لەیلا)!
بێوەژنە سیاپۆشەکە درۆی کرد
ئەو لەگەڵ وڕێنەکانیدا بیری ئەکردەوە
نا گووشیەکە وای گووت
نە تیڤیەکە وای گووت
نە خودا، نە پەیامبەر، نەئەولیاکان!



نە کەسێك کتێبە داخراوەکەی کردەوە
نە کەسیش بەقامچیەکەی گووت بمبوورە!
ژنە شەوپۆشەکە درۆی کرد
کەس نەیووت بمبوورە ئاسکە غەمگینەکە
بمبوورە.... بمبوورە
ژنە فاڵچیەکەی هاوڕێم دانی خەونەکانی پاك ئەکردەوەو
قەشمەرانە ئەیڕوانیە سەربووردەکانی من
ژنە فاڵچیکەی هاوڕێم
مافوری دەهشەتەکانی ئەتەکان و
پێشبینی پیربوونی ئێوارەکانی منی ئەکرد
چاوی لەئەستێرەکان دائەگرت و
بەهەڵخلیسکانەکانی من پێدەکەنی لەسەهۆڵبەندانەکانی
مەعریفەدا!!
ئەو دەیگووت هۆ ژنە نەعلەتیەکە
ئەی ئەوەی دەخوازی لەودیوو زوڵمەتەکانتەوە
پێکەنینی کەناریەکان بژمێری و
بەدیار گەڕانەوەی پیاوێکەوە سکێچی مردنت بکێشی
(ژیان جەنگێکی بێمانایە لەوپەڕی گێلیداو
بەختەوەری خەوتنەلەئەگریجەکانی دەبەنگیدا)
ئەو بێمانایانە ئەیڕوانی منیش بێمانایانە بیرم ئەکردەوە!
من دەمگووت:

(گرنگ ئەوەیە هەردووکمان دەرژێینە ڕەحمی ئێوارەیەکەوە
کە پێی دەوترێ ئێوارەی فەتارەتی ئینسان)
گرنگ ئەوەیە هەردووکمان
بەیانیان ساکەکانی تەنهایمان ئەپێچینەوەو
لەجەنگەڵە تاریکەکانی عەشقدا
ئەم گەمەیە دەنووسینەوە
گەمەیەك کەس نەیتوانی بیگەیەنێتە کۆتا ..!
ئەو بێمانایانە ئەیروانی منیش بێمانایانە بیرم ئەکردەوە
من دەمگووت: دڵم ئەڵێ
(مەسیح)ی ئەم موحیبەتەدەگاو
(مەهدی)ی ئەم فەرتەنەیە دێتەخوار
من تاکۆتا لەچاوەڕوانی پیاوێکدا
کلاّوی ئەم تەمەنە ئەچنمو
ئینجانەی ئەم بێدەنگیە ئاودەدەم..
هاوڕێ بێژەرەکەم بەیانیان
بەر لەوەی پەردە لەخوێن ئوتوکراوەکان لا بداو
جگەرەکانی ڕۆحی لەم خەڵوەتی تاریکیەدا پێ بکا
بەرلەوەی پەنجەرەی مەعریفەکانی بکاتەوەو
کۆترە باڵق بووەکانی ڕوانینی لەم باخچەی وجوودەدا بەربدات
بەر لەوەی لیستی ئەو گولاّنە بنووسێتەوە
کە لەبیرەوەری باخچە کاڵفامەکانەوە هەڵگیرابوونەوە



بەر لەوەی خەیاڵی ئەو کەروێشکە چکۆلەیە لێك باتەوە
کە لەخەونی ڕاوچییەکی پیردا پێکرا،
هاوڕێ بێژەرەکەم
بەیانیان بەر لەوەی دەفتەری یاداشتی ئەو قەیرە کچانە بکاتەوە
کە بە ئەسەفەوە ئەیانگووت:
تکایە هاوڕێ بەر لەوەی عەورەتی ئەم بەیانیە دەربکەوێو
شیری ئەم سپێدەیە بخورێتەوە
چاپی دووهەمی تەنهایمان بخوێنەرەوە
ئەی ئاسکە غەمگینەکە
دواهەمین سکێچی مەراقمان لەستۆدیۆ شووشەیەکەتدا هەڵواسە
ئاخر تۆ هەمیشە عەشق ئەفرۆشی
وەلێ بەبرینەوە ئەگەڕێیتەوە!!
ئاخر تۆ هەمیشە پێکەنین ئەبەخشیتەوەو
کەچی نیگات ئەسرینی پەمەیی ئەگریّ!
هاوڕێ بێژەرەکەم
لەچاوەڕوانی هاتنی دەنگێکدا بەمنی دەگووت:
بەداخەوە بەرچنەی سواڵە وەریوەکانم ئەچنمەوە
ببوورە میوانەکانم چ وەرامێکیان
بۆ عەشق
بۆ جەنگەڵ
بۆ مەرگ

بۆ ئەو گەڕەلاوژەیە کە پێی دەوترا (ژیان)
پێ نەبوو!!
منیش لەچاوەڕوانی پیاوێکدام
بمبەخشە لەچاوڕوانی دەنگێکدا
کەزییەی سەحەرەکانم دادەهێنم و
چاوی مەستی ئەم گومانانە ئەڕێژم،
منیش لەچاوەڕوانی گەڕانەوەی پیاوێکدا
سەرم ئەسپێرمە دەست ڕەشەبای وەرزە تاڵەکانی ئینتیزاریو
دڵیشم بەئەمانەت لەئاپارتمانی پشکۆکاندا ئەشارمەوە
ببورە هاوڕێ،
خۆزیا ئەوەندە بەیەك نەچووباین
لەم فارگۆنە تاریکەدا کە پێی دەوترێ (نیشتمان)
لەدیرۆکی ئەم وەرزە ئیفلیجانەدا کە پێی دەووترێ (حەقیقەت)
بەڕوخسەتت با هەردووکمان
لەم ماڵە شووشەییەدا بیر بکەینەوەو
هەر کەسەمان پەنجەرەی خۆی بکاتەوە
ئەگەر حەوسەڵەی نەزەرت لەبەردەم پەنجەرەکاندا پێماوە؟
ئەزانیت هاوڕێ
من بەدیار گەڕانەوەی پیاوێکەوە
بەپەنجە قوڕاوییەکانی یەئسمەوە
دەفتەری ڕۆژەکانم ڕەش ئەکەمەوە کە نایە!!



ئەزانم تۆش وەختێ پایپەکەت پێ ئەکەی
وەختێ فلووتی بەردەکان ئەژەنی
ئای کە شەونامەی گەشتنی پیاوێك ئەنووسیتەوە کە نایەیە!
تکایە ئەم دەقە بەکراوەی جێبهێڵە
من تەنهایی چاوەڕێمە
پەرەگرافەکانی پاشتری ئەم تێکستە بە بەتاڵی بهێڵەرەوە
من دڵنیام ڕەوە ئاسکی تر پەناهەندەی ڕۆیەتەکانت دەبێ و
لەبەر فوارەی چاوەڕوانیەکانتا
ڕووت ڕووت دەبێتەوە،
ئەمێستا بیرت نەچێ
ئاسکێکی غەمگین لەژێر لێزمەی بارانێکی تەنیاترا چاوەڕێتە
پێم وایە دەیەوێ بدوێ!!

1- مەبەست لەخانمی گەورەی ئێرانی فروغی فروغ زادە، هەردوو کۆپلە شیعریەکەش لەدەقی (کەسێکە لە هیچ کەس ناچێ) وەرگیراوە..
2- مەبەست لەقامچی بۆ ئەو ووتەیەی نیتشەدەگەڕێتەوەکەلەزمانی پیرەژنێکەوەبەزەردەشت ئەڵێ کەچوویەلای ژنەکەت قامچیەکەت لەبیر نەچێ!!

تێبینی:
(ئەم دەقە لەحەوتەمین فیستیڤاڵی 2003 گەلاوێژدا خەڵاتی یەکەمی پێ بەخشراوەو وەرزی دووهەمی ئەم دەقە لەساڵنامەی 8 مارسی ڕۆژنامەی ژیانەوەدا بڵاوکراوەتەوە)



**وەرزی دووەمی**

2

**(لەچاوەڕوانی پیاوێکدا)**



میرۆ گیان،

دووبارەنەگەشتنەوەت باش

لەچاوەڕوانی گەشتنەوەی تۆدا

پەنجەرەی ئاسکەکانی دیکەم کردەوە

هاوریێ بێژەرەکەم وای ووت:

ئاسکێکی غەمگینترلەژێر لێزمەی بارانێکی تەنیاترا چاوەڕێتە

پێم وایەدەیەویێ بدویێ.

چاوەڕوانیت باش هاوڕیێ

ئەمەیان وڕێنەکانی خۆتو ئەوەشیان دەقەدۆڕاوەکەی من،

درەنگمەئەبیێ بڕۆم،

بەم هەمووەنەعشەی ئومێدمەوە،

لەمۆنتاژی بەیانیەکی تر ببمەوە،

وادەمەدەفتەری یادنامەی دەقەسەقەتەکەی هەردووکمان کۆپی بکەمەوە،

ئاخر تۆ بیێ ەودەدەتەویێ

ساکەشینەکانی زاکیرەت بەتاڵ بکەیتەوەو

مەعەمای ئەم ئەم بێزارییەهەڵبێنیت،

ئەدرەسی باغستانیێ بدۆزییەوەلە ڕۆحی پەتی ئاو،

تامەرگ بڕکا .. نمەنمەژیان بچنیتەوەو،

تانابوت کردنی شەهامەت

تۆنەکانی ئیحساس بژەنیت..

بێ ئازمایش.. گەلاڵەی ئەم خەونەسەرابیەببەخشیەوەکچەکانت و

شیری ئەم ورێنانە ڕۆکەیە زاری ئەولادەکانتەوەو،

لیباسی خوێن گرتووی نائومێدیەکانت

بسپێریتەوەتەنافەکانی خۆ کوشتن ..

درەنگمەئەبێ بڕۆم،

ئاسکێکی غەمگینتر لەدەریاکانەوەبانگم ئەکات

ئاسکێکی تر

پاش دواهەمین سەرجێی لەگەڵ شەپۆلەکان و

خستنەوەی یەکەمین وەچەی لەتوخمی ماسیەکان بەمن ئەڵێ:

نازری وەرزەپیرەکانی خۆت بە

ئاخر من،

لەمۆنتاژکردنی چاوەڕوانیەکانمەوەفێربووم،

کەمەرەکەبی دڵم..

بەشی نووسینەوەنوسخەی دەیەمی ئەم عیشقەی تیانەماوە،

درەنگمە هاوڕێ ..

تۆ لەچاوەڕوانی گەڕانەوەی مێرۆ دابە ..

ئەو لەدەریاکانەوەبانگم ئەکات،

پەیکی پێکراوی عیشقی ئەو،

لەخەونی منالێکی ڕاڕا ئەچێ ..

وەختێ پێ خاوس بەکتێبەدڕاوەکانی بن دەستیەوە

لەحەوشی سەراب ئاسای خوێندگادا.. ئەوەستێ



بەدەم كرۆشتنی نینۆکەخۆڵ گرتووەکانیەوەئەڵێ

(بەداخەوەمامۆستا

موحیبەت لەئێوارەیەکی بێ باکدا لەگەڵ دۆکەی دادەڕژاو

کەسمان کۆمان نەکردەوە!!)

پەیکی پێکراوی عیشقی ئەو

لەدڵی شکاوی کچەشاعیرێکی تەنیا ئەچێ

ئەو دەمەی لەبەرپێی وەرزێکی خەمساردترا هەڵی دەگرێتەوەو

دەیداتەدەست وەرزێکی تر..

ئەو وەختەی بەدەم هەڵکردنی نائومێدیەکانیەوە

پێڵوەکانی وێك دێنێتەوەو بەئەستێرەکان ئەڵێ:

بەداخەوەکەئیدی ناتوانم

تا بیرەوەری بڕکا تریفەبچنمەوە

تا ژیان بڕکا فەرهەنگی گوڵەکان هەڵبدەمەوەو

لەنێو لەپی خوێناوی نەوڕەسا خەونی شینی دەریا ڕاڤەبکەمەوە،

بەداخەوەکەئیدی ناتوانم

لەبەر بریقەی جەنگەکاندا

دەقەکانی بەرائەت بنوسمەوە..!!

ناتوانم شایەتومان بێنم بەعیشق و

لەبەر بارانا بەڕووتی

(ئێوارەی پەروانە)

بخوێنمەوە..

بەبەختیاریش بڵێم :
تەواو ئیدی پەروانەبەتەنیا
لەخیابانی فەنتازییاکانی تۆدا پیاسەی شپرزەیی ناکا !
ئیدی پەروانە بەتەنیا
لەعاسیمەی خەیاڵە شەفافیەکانی تۆدا
گۆرانیەکانی فرین ئەزبەر ناکات ..
هاورێ گیان
ئەو ئیدی لەماڵەکانی ئێمەدا بیر ئەکاتەوەو
لەژوور سەری کچە تەنیاکانی من دا،
خەون دەگۆڕێتەوە،
ئەو ئیتر لەبیرەوەریمان دائەنیشێ و
گۆرانیە مورتەدەکان و خەونی پڕوکێنراوی
ژنە کەڵەگەتەکانی من
زاخاو دەداتەوە..
درەنگمە هاورێ
ئەو لەدەریاکانەوەبانگم ئەکات،
ئەو درزی پەنجەرەیەکی رووشاو ئەکاتەوەو
بەنەزەرەکانی من ئەڵێ :
تەماشا ئاسکەغەمگینەکەتەماشا ،
بڕوانەژنێك لەئاسمان،
بەدەم کرماندنی سێوە لاسورەکانی لەزەتەوە



پۆزش بۆ دەبەنگیەکانی دەهێنێتەوە
کە وەچەی ئەو هەموو تەنهاییانەی خستەوە..
ئەو لەژێر گومەزەکانی ماچ دا،
بەدەم گوشینی پەنجەکانی ئادەمەوە
پێشبینی قەتڵوعامی خەونەکانی بیر بردەوە
ئەو لەژێر گومەزەکانی ماچدا
فرسەتی بەشەرگەکان بەخشی و
ئۆخژنی مەحروم کرد لەئینسان،
ئەو بەدەم ڕنینەوەی بیرەوەرییەکانیەوە،
بانگی ئەکرد :
( هۆ ئادەم ،کوا لەکوێیە شەوەبەنەشئەکانی مەرحەمەت و،
گەڕانەوەبەخیابانەکانی کەرامەت ..؟ )
کوا لەکوێیەوەرزی چنینەوەی نێرگزەکانی نەزەرو
دەسکەنەکردنی موحیبەت..؟
ئەوان کچ و کوڕە جاهیلەکانی ئێمەبوون،
کۆگاکانی پێکەوەبوونیان فەرەود کردو
نمەکی قوربانیەکانی من و تۆ نەیگرتن !!
هۆ ئادەم
ئیدی تەواو
لەنێوان رووتی من و مەستی تۆ دا
پەنجەرەیەك نەماوەشپرزەیی نەیکاتەوە!

لەنێوان خەونی من و حەقیقەتی تۆدا،
مەرحەبای غەریزەیەك نەماوە
دوو کەناری عاشق بەدزی قەفەسەکانەوە بیکەن لەیەکتر،
ئادەم تەواو
ئیدی تەواو،
من هزرم بەم بێهودەییە خومخانەو
لەتەماشا کردنی نێو ڕەحمی کچەکانم نابمەوە
کەپڕ بووەلەتوتکەسەگ
تۆش بگەڕێرەوە سەر ڕەنگی کوڕەکانت
کە ڕەنگیان لەڕەنگی پڵنگێکی خەسیوو ئەچێ
لەساتی هەڵخەڵەتاندنی ئاسکێکدا !
ئاه ئادەم
بەم بێهودەییا ئەزانم
من و تۆ گەمەیەکی هیچمان کردو
یەکەمین حەرڤ حیکایەتێکی شپرزەمان نووسیەوە،
بڕوانە ئادەم تەماشا،
من لەچاوکردنی نێو ڕەحمی کچەکانم نابمەوە
ناتوانم بڕوانمە ڕدێنی بۆزی کوڕە باڵق نەبووەکانمو
دڵم ختورەنەکا ..
ئاه ئادەم
گەمەکەمان چۆناهی بەتاڵ بوویەوە،



چۆناهی عیشق لەگێمەکانی دڵ کرایە دەرەوەو
نائومێدی بەدواهەمین گۆڵی شێت بوون
مۆندیالی ئەم فیراقەی بردەوە!!
ئادەم تۆ لەکوێی ؟
تۆ لەعەردی یان لەئاسمان
لەپەنا وردەشەڕی ماسی و ناخوداکانەوەو نووستوی،
یان گلەیی بێ فاسیلەی خوناوەکان
لەپشتی چەترەکان ئەنووسیتەوە؟!
ئادەم تەواو
وەرزە گوڵ گوڵینەکانی پێکەوەبوون و
شەونشینیە میسك ڕژێنەکانی لێك گەیشتن،
ئادەم تەواو،
عەشق تەواو ..
تۆ لەکوێی خاکستاری کام متمانە کۆئەکەیتەوەو
سەعی لەبێدەنگی کام کزەبادا ئەکەیت؟
ئادەم تەواو ..
دڵم تەڕ تەڕ لەبێدەربەسیەکانی تۆ
حەوسەڵەم شپرزەیە بەبێ مروەتیەکانت ..
ئەوان کچ و کوڕە ناکامڵەکانی ئێمەبوون،
بەدەم گلەییە ساردەکانی هزریانەوە نووسیبویان:
ئێمەش تەواو،

ئیدی شەرحێکمان بۆ وتن پێ نەماوە.

ئێمەش تەواو

موعەدەلی ئەم ئارامیەمان دەکاتە هیچ ..

وەزیفەکانمان تەواو کردو

ڕاسب بووین لەتاقیکردنەوەکانی پێکەوەبوون و

نووسینەوەی دوواهەمین داڕشتنەکانی ئیرۆسیەت و

گەڕان لەدووی ئەو کەرتە ئاوێنەیەی

کە بڕیار بوو پاش خوێندنەوەی دەقی (ئاسکە غەمگینەکان)

بیگرینەوە عەورەتی بێدەنگیەکانی یەکتر...

ئادەم تەواو

ئەوان هاوکێشەکانیان هەڵگێڕایەوەو

حاشایان پێکردم لەو ماچانەی بەدزی پەرییەکانەوە پێم دای .

حاشایان پێکردم

لەو وردە خەونانەی

لەپشت کاڵای گەڵاکانەوە دەمان بینی ..

نەفرەتیان پێکردم لەو دەرگایانەی بەدزی حەڵاڵەکانەوە

بۆم کردیتەوەو،

نەفرەتیان پێکردم لەیەکەمین خەوتنم لەگەڵ تۆ،

لەیەکەمین ڕژانم لەگەڵ تۆ !!

ئادەم تەواو،

پەنجەرەکانی بینایيت بکەرەوە،



بڕوانە شەونامەی چاوەڕوانیەکانی ئەو (میرۆ)

بڕوانە چاوەڕوانیەکانی ئەو ژنەی،

لەبەردەم وەرزە ساردەکانی عشق دا

بەردەوام دەیگووت :

(کەسێ دێ )...!!

بڕوانە وڕێنەکانی ژنە فاڵچیەکە ..!

بڕوانە دەستنووسی قەیرە کچەکان و

هاتنەوەی فیکرەی بەتاڵی کچە بێژەرەکە..

ئادەم تەماشا .. دڵی شکاوی کچە شاعیرەکەو،

فرینەکانی پەروانە..

خوێنی مەییوی ئاسکە برینداره‌کەی دەریا ..!!

ئادەم تەواو،

حاشا لەبوون،

حاشا لەکردنەوەوی پەنجەرەکان،

حاشا لەنووسینەوەوی گازندەی ئاسکە غەمگینەکان ..

ئادەم تەواو ..

برۆرەوەسەر ڕەنگ کردنی خەمساردیەکانت،

من لەتەماشاکردنی نێو ڕەحمی کچەکانم نابمەوە،

ناتوانم بڕوانمە ڕدێنی بۆزی

کوڕە باڵق نەبووەکانمو دڵم ختورە نەکا ..!!

ئادەم تەواو،

ئیدی تەواو ..
ئادەم تەواو
(عەشق تەواو) ..

میرۆ گیان،
دووبارە نەگەشتنەوەت باش،
ئەم دەقە بەئەمانەت ئەسپێرمە دەریا،
لەچاوەڕوانی تۆ دا .. پەنجەرەیەکی دیکەئەکەمەوە..
لەچاوەڕوانی تۆدا .. جەنگی ڕەوەیە ئاسکی تر ئەنووسمەوە..
دووبارە نەگەشتنەوەت باش،
(میرۆ) گیان
نەگەشتنەوەت باش ...............

2003/3/5



(منو ئاراگۆن لە بەیانیە تاکەو تاکەکاندا )



دەنگ دێ دەنگ دێ دەنگ دێ

دەنگ دێ

ئایا ئەمە وڕێنەیە بۆ تۆی ئەنوسمەوە..

یان غەفڵەتێکە لەتەنهایم ئەڕژێ....

دەنگ دێ ...دەنگ دێ ....دەنگ دێ .

ژوورەکەم پڕ دەبێ لە مرواری وشە

لەکەرتە ئاوێنەی دەنگ

ئایا بەدەم خەوەوە عاشقت بووم؟

ورتە ورتێکە لەوتن،

کردنەوەی بێدەنگیەکانی ژنێك بەهێما،

ئەوکاتانەی لەودیووی پەنجەرەکەوە بانگم ئەکات:

بەیانیت باش ئەلیزا.....

بەداخەوە ئاراگۆنی من هەمیشە درەنگ دەگات،

هەمیشە لەگەڵ باراندا پەنجەرەکەم دەکاتەوە،

دەبینێ ئەوەی ماوە،

تارماییەکە لەسەر بوردەو

چنگێ سەراب‌و بەرچنەیە قسەی بێ مانا.

بەداخەوە ئاراگۆنی من هەمیشە درەنگ دەگات

ئاراگۆن هەمیشە بەمەستی و

لەگەڵ خوڕەی باراندا بەبوتڵێ عیشقەوە

پەنجەرەکە ئەکاتەوە..

هەمیشە دێ،
پەنجەکانی بۆنی شەرابێکی خەست و
لێوی تامی شیعرێکی تازە خەمڵیوو
چاوەکانی چەشنی دوو گێلاسی گەیوو سور دەچنەوە،
ئاراگۆن
لەپەنجەرە شەفافیەکانی عەشقەوە ڕووتیم ئەبینێ..
وەك شەرمەزار بێ لەوتن
بەهەڵمی دەم لەشووشەکان ئەنووسێ:
بەیانیت باش ئەلیزا،
بۆ شەوێك میوانتە پیاوێکی ڕاگوزەر،
میوانتە پیاوێکی ماندوو،
میوانتە پیاوێك
هەمیشە لەبەیانیەکاندا بۆنت دەکات،
هەمیشە لەبەیانیەکاندا بەسەر بەختی تۆدا هەڵ ئەکاو
ژوورەکەی پر دەبێ لەهەناسەکانی تۆ،
بۆنی تەنهایی تۆ بالیفی عومری ئەتەنێ ..
هەر لەبەیانیدا دەنگێکی غەریب پێی ئەڵێ:
(شەهیدە ئەو ژنەی بەنهێنی عەشق ئەکاو
بەهێمنی گۆرانیە حەرامەکان
ئەباتە ژیر لێفەی خەیاڵە ئاوییەکانی خۆییەوەو )
شەهیدە ئەو ژنەی



بەنهێنی ژیان ئەگرێو هەمیشە قسەیەکی تایبەتی هەیە لەگەڵ
خوا..
ئەلیزا ببورە
ژیان فێری کردم
هەمیشە لەگەڵ بارانداو
بەڕووتی بێمەوە بەر پەنجەرەکەت و
وەك کو کوختیەکی بەجێماو
دوا ویردی عەرافە سیاسەت بازەکە بڵێمەوەو
کە دەیگووت:
تۆ ئەبێ بۆ چوونە دیدەنی ژنە عاشقێکی تەنیا
هەوساری ئەستێرەیەك بگریو
عەتری شیعرێکی تازە عازەب لەخۆت بدەیو
گیرفانەکانت پڕبکەیت لە وردە گۆرانی
(بەیانیت باش ئەلیزا)
ببورە درەنگ گەشتمە بەر پەنجەرەکانی تۆ و
درەنگ بەفریایی تروکاندنی دەنکەگوڵە
بەڕۆژەکانی عەشقی تۆ کەوتم
ژیان پێی وتم:
(شەهیدە ئەو ژنەی هەمیشە بەنهێنی عەشق ئەکاو
هەمیشە بەهێمنی گۆرانیە حەرامەکان
ئەباتە ژێر لێفەی خەیاڵە ئاوییەکانی خۆیەوە)

ژیان پێی وتم و کانیلەیەکی شەرمن
دەمو چاومی بەعەورەتی خۆی تەڕکرد،
نەیهێشت گلاَسەکانی بەختم
لەهەنگوینی ڕویەتەکانی تۆ فڕکەم ..
ببورە چیمەنێکی سەرخۆش،
دوگمە سەوزەکانی سینەی بۆ کردمەوەو
وەك منالێکی پۆشتە
مەمکی لەزارما ڕاگرت و
خەوی لێخستم،
مەست بووم ئەلیزا
مەست ..مەست ... مەست
مەستیەك کە نەیهێشت
گوێم لەخرنگە خرنگی بازنگی زەندی دڵی تۆ و
گوێم لەهاڕەکردنی گۆزە شکاوەکانی ئیحساس و
گوێم لەگۆرانیە تیرۆرکراوەکانی نەزەرت و ...،
نا نەیهێشت
وەك خوێنەرێکی زیتەڵە یاداشتی ئەو ڕۆژانە هەڵبدەمەوە
کە بانگت دەکردم
ئاا ڕڕڕڕااگۆۆۆۆۆن
هەمیشە ژیان
گۆرانیەك ئەڵێ و مردنیش گۆرانیەکی تر



وەرەبا ئیحایی گۆرانیەکی تەنیا بدۆزیینەوە
نەبچێتەوە سەر نەزمیی گۆرانی ژیان و
نەبچێتەوە سەر تۆنی گۆرانی مردن ..
نا ...نەیهێشت
گوێم لەخوێندنەوەی ئەو شیعرەبێت
کە لەبەیانیەکە تەڕ بەبێدەنگیتا
بۆ کەنارییە شەرمنەکانی جەستەت ئەخوێندەوە،
وەك دەروێشێکی بەجەزبەزرگت لەسینەی تەنهایت ئەداو
بەدەم ئیحای بەختتەوە دەتگووت:
(وای دڵی من
چەند بێ ڕەحمانە شکای !!)
ئەلیزا لەدرەنگ هاتنم ببورە
بمبوورە لەوەی نەمتوانی بۆ شەوێکیش
لەگەڵت بێمە کۆلان و
ئەوکاتانەی ڕێگاکانت لێ ون دەبێ و
بەدەم ژماردنی ئەستێرە تاریکەکانی عومرتەوە
کە وشە تاکەو تاکەکانی بیرەوەریت لێ جێ دەمێنێ،
ئەو کاتانەی وەك پەرییەکی چکۆلەی پێپەتی یالْ ئالۆزکاو
بانگم دەکەی:
ناا......... ئاراگۆن..... گیان.... ناا
تکاییە بەدەم ئەو هەموو تەنهاییەوە ونم مەکەو

بەدەم ئەو هەموو تاریکییەی دڵتەوە دامگیرسێنە!!
دەنگ دێ ... دەنگ دێ....
دەنگ دێ
ئاراگۆن هەمیشە درەنگ دەگات
نامپەرژێ پەنجەرەکەی بۆ بکەمەوە،
ناتوانم بەماچێك لەو پەڕی تەنهایمەوە
ڕووتی کەمەوە...
وەك شازادەیەکی ماندوو
بیهێنمە عەرشی مین ڕێژکراوی جەستەمەوە !
نامپەرژێ
ئەو وەختەی کەئەو دێ
من کراسە دڕاوەکەی یوسف پینەئەکەمەوە
بیر لەوەئەکەمەوە
لەم تەنگەبەرایی عومرا
تەنهایی ترۆپییەیان مردن ..
من کراسە دڕاوەکەی یوسف پینەئەکەمەوەو
تەسکینم بەبۆنی وونبونی خۆم دێ
نامپەرژێ پەنجەرەکەی بۆ بکەمەوە
من کتێبی بێدەنگیەکانی فەرەیدوون ڕاڤە ئەکەمەوەو
بەفڕینەکانی پەروانەدا دێمەخوار ..
خەو بە ئێوارەیەکەوە ئەبینم،



پیاوێکی تیایە پڕ کتێب،
باخچەیەکی هەیە لێوان لەچۆلەکەی سپی
دوندێك لەبەفری قەترانی ..
ئاراگۆن ببورە تۆ درەنگ گەشتی ..
ببورە ئاراگۆن گیان هیچ نەماوە،
نە شیعر،
نە جوانی،
نە ئەلیزا !!
ها ئەمە ئەڵقەی دەزگیرانی تەنیایی و
ئەمەش ڕووسورییەکەی خۆمو بێدەنگی ...
دەنگ دێ
دەنگ دێ .... دەنگ دێ ....
وای ئاراگۆن
چەند درەنگ هاتی،
من بۆنی تەنهایی خۆم کوشتمی و
تا دوا تنۆك بەدیار حیکمەتەکانی مەرگی خۆمەوە ڕژام،
ڕژامو دەنگێك نەبوو کۆم کاتەوە،
ڕژامو وەك باجی ونبونی خۆم بدەم
هاوارم ئەکرد:
ئاراگۆن
چ حیکمەتێ لەتەنهایی من کۆ ئەکەیتەوە بۆ خۆت،

میراتی چ مردنێك لەچاوەڕوانی تۆ ئەچنمەوە بۆ خۆم !!
چەند جوانە عەزابی خۆم بۆ خۆم و
چەند جوانە عەزابی خۆت بۆ خۆت !!
ئەوکاتانەی وەك هەورێکی پڕ لەخۆما ئەباریم و
چەشنی جەلادێکی خێزن
ئەوەی دەمدایە بەر ڕێژنەی گولە جەحێڵیم بوو !!
وەك ژنێکی بێ مەعریفەت
خەجاڵەتی خۆم ئەیگرتم و
سەرم بەدرەنگ گەڕانەوەی تۆ
بەردەدایەوە باوەشی پشکۆکەکانی خۆم،
نا .... ئاراگۆن گیان .... نا
جەنگی من گەورە تربوو لەجەنگی ئاشی با ..
چاوەڕوانیم لەچاوەڕوانی دۆنکیشۆت سەخت تر بوو،
تا گەیشتنەوەو بەمیرنشینەکانی دولسینا ..
ئاراگۆن من سەری جوانیم
بەتەڵەزمی بێ مروەتیەکانی تۆ شکا و
حەوسەڵەی شیعرم لەئینجانەی سەفەرە هەمیشەیەکانی تۆدا ڕژا .
وەك مرواریەکی تەنیا
لەچاوەڕوانی هیچ کەنارێکدا نەدۆزرامەوە...
دەنگ دێ ..... دەنگ دێ ...
دەنگ دێ ...



ئاراگۆنی من هەمیشە درەنگ ئەگات،
ئەوکاتانەی من وەك شەمشە کوێرەیەکی یاخی
ئاوازی شەوە دوورەکان ئەنوسمەوەو
وەك حیکایەت خوانێکی پیر
سەربوردە ژەهراویەکانی سەرم،
بۆ دۆستێك کە نازانم هەیەیان نا
دەگێڕمەوە..
وەك چۆلەکەیەکی کەنەفتە مێژووی ئەو هێلانانە ئارشیف
ئەکەمەوە
کە لەبیێهودەیی دەستێکا با بردنی ..
وەك ژنێکی دۆڕاو بەژیان
وێڵی کلیلێکم قفڵە ژەنگاویەکانی بێدەنگمی پێ بکەمەوە،
ئەگەڕامەوە سەر لاپەڕەیەك فێرم بکات :
بەم هەمووە تاریکیەوە جوانە ژیان،
بەختەوەرە ئەو ژنەی لەقۆزاخەی خەونێکی خۆڵەمێشی دا
حوکمی باخچەیەك ئەکات لەپەموو ..
بەختەوەرە ئەو ژنەی
لەسەر بەرماڵی هەتاو
تەحیاتی ڕوناکی ناخوێنێ و
تەنها لەشەودا تاریکی ناچنێتەوە..
بڕوا ناکات بەپیاوێك

وەك مایل بەماچێك
مەست بەتەنها شەوێکی پێ ئەڵێ،
گرەنتی بێ
تا دواهەمین پەردەی ئەم بەدبەختیەی تۆ،
تا کوژاندنەوەی دواهەمین پشکۆکانی ئارەزووت،
تا پیربوون لەسەقەرەکانتا ئەمێنمەوەو
بەم هەموو عەزابەوە بۆنت دەکەم ..
بڕوا ناکات بەو پیاوەی بەشەرمی پێغەمبەرێکی ترسنۆکەوە
ژانتاکەی پڕ دەکات لەنارنجو
بیستوون ئەخاتەوە سەرشان
قوڵینگەکەی فڕێدەداتە دەریا،
نیگای وەك چاوی کوکوختی هەڵ ئەکا:
ئەی یار تکایە دڵۆپێ بۆنی خۆت
من ڕجوع بوومەتەوە،
لەیەکەمین سەرجێیم
لەگەڵ خەنجەرو،
حاشام لەیەکەمین وەچەم لەتوخمی خوێن !!
ڕجوع بووم
لەتەنهایی خۆم ...
ڕجوع بووم لەمەودا مین جاڕییەکانی دووری تۆ،
ڕجوع بوومەوە



لەو شیعرانەی لەسەر خودەی جەنگەکان ئەمنووسی و
فڕێم دەدایە کوخی بێهودەی کەلەکانەوە...
تورەبووم لەو ڕۆژانەی
کریشمەی ئەگریجەتۆزگرتووەکانی تۆم
سپاردە شانە شکاوەکانی ونبوون ..
بووم بەژەنەڕاڵی وەرزە مەستەکانی سوڵتانو
جوامێری خۆم فڕێدایە لیستەکانی گەورەییەوە،
مەلەفێکم بۆ شەهامەتی خۆم کردەوە،
نا ئەی یار
لەپەنجەرەکانی تۆ وەنەبێ
ئینجانە شکاوەکانی ئەم عیشقەم بۆ ناگیرێ
ناتوانم دڵداری لەگەڵ لاولاوە بێ بۆنەکانی ژیاندا بکەم....
ئەگەڕامەوە سەر کتێبێك فێرم بکات
چۆن باوەشم پڕبکەم لەپشکۆ و
لەنیشتمانی نێرگزا نامە بۆ هەتاو بنووسم .
مرتەد ببمەوە
لەدانیشتنم بەدیار وەرزێکەوە
لەجیاتی میناو گوڵەباخ
گیرفانەکانی پڕن لەتاعونی فیراق ...
نا...... ئاراگۆن ... گیان ... نا
درەنگە بۆ گێڕانەوەی ئەم هەموو تاریکیەو

نووسینەوەوی مانڤێستی ئەم ئێوارەڕەش داگیرساوە،
بم بەخشە نام پەرژێ پەنجەرەکەت بۆ بکەمەوە،
بمبوورە ناتوانم مەستت کەم لەبۆنی شەویێکما
دات پۆشم بەعیشوەی شیعرێکم،
وەك ئەوەی تاقەتم لەدەستپێکردنەوەی ئەم جەنگە چووبێ
کراسە دڕاوەکەی یوسف هەڵئەگرمەوەو
وەك شێتێکی زۆرزان
مانڤێستی قسەکەی ئاراگۆن ئەنوسمەوەو
سەرم ئەدەمە دەست بەیانیە تاکەو تاکەکان ..
شەهیدە ئەو ژنەی هەمیشە بەنهێنی عەشق ئەکاو
بەهێمنی گۆرانیە حەرامەکان ئەباتە ژێر لێفەی
خەیاڵە ئاوییەکانی خۆیەوە
شەهیدێك لەهەتاو گەرمتر ..!!



(حیكایەتی شەوێكی تر ...)



لەچاوەڕوانی دڵم وەك هاتنی شەوێكدا بێت

خەریكە تاریك دادێت

وای خودایە ئەم هەمووە مەحشەرە چی بوون

هەڵتۆقینە ڕوانینمەوە ؟

قورس لەبەر دڵم ئەكەویٚ ژیان،

هەست دەكەم بەشی ئەوەم پێوە نەماوە كە بمرم !!

نا .. بەشی ئەوەم پێوەنەماوە

خشتەی خەیاڵی زەڕنەقوتەیەك لێك بدەمەوەو

تەڕببم بەشڵپ و هوڕی بێدەنگی گوڵەباخێك،

ئەی باخچە مرد ژنێك لەبێدەنگی ئاودا،

كەوتەخوارێ ئەستێرەیەك لەبێدەنگی ئاسماندا،

لەتر دەدات

تاقانە بیرەوەری ژێر پێستی هەستێكم

ئەو ڕۆژی كە تەنها ئاگری گەڕەلاوژەیەك دادەگیرسێنێ..

ئێستاكە ئەزانم

چەند فەریكەیە ژیان

لەغەرغەرەی چ جوانیەكایە مردن.

ئێستاكە ئەزانم نەمتوانی غەریبی گوڵێك بگێڕمەوە بەزمانی ئاو،

بەدیار قڵشینی خۆمە

ڕازێكی تر بگێڕمەوە

لەشەوی تەڕترین تاریكیەكا،

ئێستاکە ئەزانم

چەند گوناه کە نووسیت

شەو بەو هەمووەتاریکیەوەدانەچڵەکێنیت،

بەیانی ئاگادار نەکەیتەوە کە ئەگەر

قسەیەکی تازەتر نەکات ئەمرێت ..

تۆ بۆ ناروانیتە ژیان

کە هەر ئەڵێ سێبەری پیاوێکی بۆشناخە

ئەو کاتانەی بەناو تاریکیا ڕا ئەکاو

کڵاوەکەی پڕ ئەبێ لەنەسیمی شەو،

چەند لەبیدەنگی ژنێك دەچێت

کە لەسەر دۆزینی مناڵەکەیدا

بیر لەتەنهایی خوا ئەکاتەوەو بانگ ئەکات

قیامەت....قیامەت....

ئەستێرەیەکی چەندە شپرزەیە زەوی

دنیایی ئەم سەرە چکۆلە چەند گەورەیە!

ئاشوبی ئەم مەنگ بوونەوەیە

هەڵساندنی چەند نەزەری نووستوە

لەچاوێکی بێ ئاگادا ..

حیکمەتی تەنهایی گەلاّ

دەگەڕێتەوە سەر مەوسمی بێ ڕەحمی چ وەرزێك؟

مێژووی برین لەکوێی خەنجەرا ئەوەستێ و



لەش پیسی ئەم هەموو عەزابە

بەئاوی چ خەیاڵێکی مەست دەردەکرێت ؟

چەند جوانە وسڵی ئینجانە بەهەتاو،

چەند جوانە وسڵی باخچە بەباران،

چەند جوانە کەوتنە خوارەوەی ئەستێرەیەکی ترو

فڕین لەئاسمانێکی ترا ..

چەند خۆشە هێنانی شەریعەتێکی تازەتر بۆ ژیان و

گەڕانەوەی کەسێکی تر کە

(بەدرەخت و ئاوو ئاگرەوە متوربەم کات )[1]

فێرم بکات چۆناهی لەدڵی ساردی ئەم زەمهەریرەدا

مۆمێکی تازەتر هەڵبکەمەوەو

قاچی ئەستێرەیەکی تر بگرم و

هەڵوێستەلەکرانەوەی گوڵێکی ترا بکەم،

واقەواقی چەمێك بمباتەوەسەر ڕۆژەسەوزەکانی ژنێك

کەوای دەزانی

(دنیا بریتیەلەدەرك پێکردنی نهێنی ژیانی بۆقێك )[1]

نا ... دنیا بریتیە لە گۆرانیەك کە هەمیشە نامۆیە بەگەروی تۆ!

نا دنیا بریتیە لەدەقێك کە من

هەرگیز ناتوانم بینووسم و

ئەو هەرگیز ناتوانێ بیخوێنێتەوە!!

ئاخر هەندێ جار خوێندنەوەی دەقێك لەخوێندنەوەی دنیا گەورەتر

ئەبێ!
دووبارە تاریك دادێ دڵم،
ئەمە سەرەتای حیکایەتێکە کە بەتاریکی دەستپێدەکات،
تۆش ئەی وەرزێك لەبێدەنگی من
چاوت بخەرەوە سەر یەك دوو دارەکەی دارام بۆ بێنە،
چاوت بخەرەوە سەریەك و
لەدەخیلەی سمۆراندا گوێزی زل زلم بۆ بدزە..
چاوت بخەرەوە سەر یەك و
مام ورچم لەسەر هەردوو قاچ بۆ بوەستێنە،
وەك حەکیمێکی پەی بەحەقیقەت بەردە،
لەدرەختی مەعریفەتت سێ سێوم بۆ بەردەرەوە..
سێوێك لەماچ
بەداخەوە تامی ئەم سێوەیان نازانم !
سێوێك لەحەقیقەت،
هەمیشە لەژێر زەمبیلەی بێدەنگیە گەورەکاندا گەنیوە!!
سێوێك لەگومان،
هەمیشە کرمی یەقینێك تێی داوە،
نا ...... ئازاد،
سێوی دیم ناوێ ..
بەسە بەسە
هیچ سێوێکم بۆ بەرمەدەرەوە..



دنیا لەکەوتنەخوارەی سێوێکا بوو بەدوو لەتەوە،
دڵی من لەگەڕانەوەی دەنگێکا،
پارچەپارچەبوو ؟!
لەتێك هەڵگرەو وەك جانەکەی کەیکاوس
بەختی بێژەنی پێ لێك بدەرەوە..
لەتێك هەڵگرەو نهێنی دەریاکانی پێ بخوێنەرەوە،
لەتێك هەڵگرەو موعجیزەی کتوبەکانی پێ بەتاڵ بکەرەوە،
لەتێك هەڵگرەو پێی بچۆرەوە سەر تەریقەتی هەڵوەرینی نێرگز،
لەتێك هەڵگرەو بیگرە خەوێکی لەپەلوپۆ کەوتووی پەپولەیەکی
تازە باڵق،
هێلکە بەهارانەی چۆلەکەیەکی پێ بشکێنە لەهێلانەیەکی چۆڵا،
لەتێك هەڵگرەو بزانە بۆ کە نەورەس دەفرێ
بیر لەتێکدانی نەخشەی جوگرافیای لەو کەنار دەکاتەوە!!
لەتێك هەڵگرەو بزانە بۆ دەم چاوی هیتلەر
لەحەشرو نەشری دوو ئاوێنەدا دەکەوێتەخوار ..
لەتێك هەڵگرەو نێوچاوانی تەپکە گوڵەبەڕۆژەیەکی پێبخوێنەرەوە
وەختێك لەخودا حافیزی هەتاوێکی بێ مروەتدا بەلادادێت،
دڵی گەلاّیەکی پێ بخوێنەرەوە
وەختێك لەکەندەلانی بیرچوونەوەی درەختێك دا ڕەق هەڵدێت،
لەتێك هەڵگرەو
خەمی دڵۆپە ئاوێکی پێ لێك بدەرەوە

که دەریایە بەنەفرەتی ئەکاو
چاڵێکی چکۆلە باوەشی بۆ ئەکاتەوە،
لەتێك هەڵگرەو ڕدێنی پیاوێکی لەبەرا تراش کە
کە نازانێ وەرزی گەڕانەوەی یوسف
لەخەونی چ پیرە ئێوارەیەکی تەنیا دایە،
لەتێك هەڵگرەو کۆمارەکەی ئەفلاتوونی پێ تەفرو توناکە،
خەنجەرەکەی عەلی پێبکە بەدوو لەتەوە،
غەرقی کە لە فەلسەفەی پێکەکەی خیام داو
مەستی کە لەسەمای سۆفیانەی مەولانا،
لەهەر شوێن مەراسیمی ئەو هەمووە لەتە شکاوەت دی دڵی من
لەوێیە،
لەوێیە دڵیك بەو هەمووە جوانیەوە شکاو
لەتاقی گەورەی ئەو هەموو جەنگەدا کەوتەخوار،
جەنگی ئەو هەتاوە درۆزنانەی نەگەڕانەوە ماڵی سێبەر،
جەنگی ئەو تریفە مونافیقانەی لەگیرفانەکانی شەودا خۆیان
کوشت،
جەنگی ئەو گوڵە وەریوانەی کە وتیان
با بمرین لەباخچەکانی کیسرا داو نەگەڕێینەوە ماڵی باخچە،
جەنگی ئەو فەلسەفە کوێرانەی بەشەلەشەل
لەماڵی شەرمەزارییەوە،
ڕملی لەگۆکەوتنی باران و



ڕەقبوونەوەی مانگیان لێ دەداو
نەگەرانەوە خانەی هزر،
جەنگی ئەو پەیامنێرە ئیفلیجانەی نەیانتوانی
هەواڵی مەرگی کوت و پڕی هەنارو
تەعەدای بیرەوەری لەخۆیی و
خەجاڵەتی جۆگەلە لەکەنارو
بێ حەوسەڵەیی منارەلەکۆتر،
جێ مانی ئەو هەمووە کەللەسەرە
لەئاوێنەکاندا بنووسنەوە،
نەیان توانی ڕاپۆرتێك بۆ خۆ کوشتنی قەڵەم و
مارشێك بۆ چلەی ماتەمینی وتن
لەتابووتەزەردەکانی بێدەنگیدا بڵێن،
نا.. باوەڕمەکە بەژنێك کە پێت دەڵێت:
(باوەڕ بێنن بەسەرەتایی وەرزی سارد)[2]
نا ... بڕوا بکە بەژنێك لەسەرەتای حیکایەتێکی شپرزەدا کە پێت
دەڵێ:
(باوەڕ بێنە بەسەرەتای سپێدەیەك کە بەتاریکی دەستپێدەکات)
بەیانیەکیان ڕۆحم
لەدەمی کانیەکەوە ڕژاو
لەچاوی گۆمیچکەیەکی بۆگەنا فەوت بوو،
لەو ڕۆژەوە دەمزانی

جۆرێکی دیکە لەڕوانین لەمنا پێ دەگریٚ و
فیتنەییەکی تر لەمنا دوا گەرایی خۆی دادەنێت،
فیتنەیەك دەمباتەوە سەر کەللەسەری حوسێن،
دەمباتەوەسەر قەتڵ و عامی کەربەلا.
ئەوە دەشتی کەربەلایە یان دڵی من!
ئەوە سەری بڕاوی حوسێنەیان سەری بڕاوی خەونی من،
دەمزای گەرایی ئەم فیتنەییە
کردنەوەی هەزار دەرگایە لەجەنگ،
دانیشتنی هەزار باخچەیە لەئەژدیها،
دەمزانی قات و قڕی وەرزێکی دیکەیە لەپێکەنین و
چەڵەمەشکێنەی شەوێکی ترە لەبێهودەیی
دەمزانی گۆڕەو شاری ئەو خەونانەیە کە نەگەیشتوونەتە سەر
لێوی خەیاڵ.
فەرهود کردنی گۆرانیەکە کە نەگەشتۆتە ماڵی وتن،
دووبارە تاریك دادیٚ دڵم،
قورس لەسەرم ئەکەویٚ ژیان!
هەست دەکەم بەشی ئەوەم پێوە نەماوە کە بمرم ..
خودایە چەند خۆشە
گەڕانەوەی کەسێکی ترو
هاتنەوەی شەریعەتێکی تازەتر،
شەریعەتێك ئەو ماسیگرە پیرانە شەرمەزار نەکات



کە بانگیان دەکرد:
(هەی دەریا
تۆش نەبیت ماسی ئێمە لەقولایی ڕۆحێکی نووستوودایە)
شەریعەتێك فرسەتی پیاسەی دوو پەپولە نەکوژێت،
لەڕاستەڕەوی باخچەیەکی ترۆکراودا ..
بیر لەهەڵپڕوسکاندنی گوڵێك نەکاتەوە
لەجۆگەلەیەکی مولحیدا!!
نەیەتەوە سەر ڕێی کابانیٚ
کە گۆزەکەی پڕ دەکات لەمانگەشەو
لەو هەمووە تەنهاییە هەڵ ئەنوتیٚ و
بەو هەمووە خەیاڵە قڵیشاوەوە
بەبیرەوەری خۆی ئەڵیٚ:
–ئەژیم چونکە حیکایەتێکم ماوە،
هەمیشە ئەوانە ئەبیٚ بمرن کە حیکایەتێکیان نیە!!
شەریعەتیٚ شاورەکەی لەفاولیٚ بەیانیەکی سەرخۆش دا
دەرنەهێنی و
لیستێکی دیکە لەگوناهی
بزنەکە شێتەکەی شێرزاد نەنووسێتەوە
وەك کفری زەمەنێکی دۆڕاو
(دوا هەنارەکەی بەختیار ڕاڤەنەکات)
ماتماتیکی نەزەری ئەو کچان فەرامۆش کات

که پڕ بوون ئەبڵقی حەرام.
شەریعەتێ لەناشکوریەکانی ئەو مەیتەرە تەریکە ببورێ کە دەیگووت:
(دنیا سۆزانیەکی پیرەو هەر شەوە لەماچێکدا سەری خۆی بەزەمەنێکی تر ئەسپێری)
سەرێك پڕ لەئاشوب،
سەرێك پڕ لەهەڵاویێرانی براکان لەیەکتر ..
سەرێك مەست بەفڕکردنی پێکەکانی خوێن لەجامی دڵی یەکترو،
سەرێك حەڵاڵ بەخەوتن لەپێخەفی ئەو هەموو نامورادیا،
خودایە چەند خۆشە گەڕانەوەی کەسێکی ترو
هاتنەوەی شەریعەتێکی تازەتر،
تەقینم وەك دەنکە قەزوانێ لەدەمی زەمەنێکی ترداو،
سەمام وەك دەوارێکی شڕ
لەجەزبەی باڕەشێکی ترا،
فڕینم لەئاسمانێکی بەرین ترو
سەرخەوم لەکۆشی شەوێکی ترا،
ئاسمانێك..... لەبیرکردنەوە!!
شەریعەتێ .......لەشیعر !!
سەرخەوێك ...... لەئارامیو !!
هاتنەوەی کەسێکی تر ....... لە.........؟!!



1+3 دیڕێکی فروغی فروغ زادە، هەروەها گەڕانەوەی کەسێکی تر کە بەدرەخت و ئاوو ئاگرەوە متوربەم کات هەر هی ئەو ئەزیزەیە.
2– هەڵویێستەیە لەدێڕە شیعرێکی خاتوو کەژاڵ ئەحمەد لەدەقی بچوکێ حەیف گەورەبوو..

2003/10/20



## کوشتەی قاسیدێکی تر...

بۆ بەهەشتو جەهەندمەکانی شەهید کەوڵۆسی هاوسەرم پێشکەشە



بەیدەبا،
ئەگەر دڵۆپێك لەڕووناكی دنیاو
تنۆکێك لەحیکمەتی ژیان دا ماوەتەوە پێم ببەخشە،
فێرم کە بەم سەوڵی شێتیەوەو
لەم بەلەمەکوناو دەربووەی تەنهایمەوە
ئەم بەحری خوێنەبڕە و
هەڵکورمانی ماسیەکی عازەب لەکەڵبەی حوتێکدا تەریقم نەکاتەوە،
بەیدەبا ... بەیدەبا
لەقودسیەتی عەقیدەیەکی ئیفلیج خلیسکاوم و
لەبێحورمەتی شەوێکی تووش هاتومەوەو،
ماتڵی کۆکردنەوەی دۆسیەیی خۆکوشتنی کەناریەکم لەشەوی
ناتەبای فڕینکدا،
چەند ئەترسم، ئەممە دوا ونبوونو دوا گەمەبێ لەکایەیەکدا
کە من لەئەزەلەوە بەدۆڕانەکانیەوە متوربەکراوم،
دەخیلە بەیدەبا،
لەسەر مافوورە تەڵخەکانی حەقیقەتت
داخوازیم کە بۆ کوڕە زۆڵەکانی حیکمەتت و
لەئاوریشمە سورمەیەکانی ڕوانینتا بم خەوێنە،
فێرم بکە قەترە قەترە لەبێدەنگی دەریا وردببمەوەو
چرکە چرکە لەساتی ڕەقبوونەوەی ماکەوێکدا هەڵبکورمێم،

گەر شەوێك
گەر شەوێك ئەستێرە نووستووەكانی سینەم خەبەر نەكەیتەوەو
مرواریيەكانی گلێنەم هەڵنەگری‌و
لەدڵۆپەی ماچێكا نەزانیت
هەمیشە باران لەتەنهایی منەوەڕێ ئەكا نەوەك لەچاوانی ئاسمان،
گەر لەگەڵما یەكەمین سەرخەوی ئەم پەشیمانیە نەشكێنیت و
دەست نوێژت بەتریفە نەگریت و
دوا تەواف‌و دوارجوعت
لەسەر پارلێمی نێرگز دانەبەسیت،
چەند ئەترسم،
پۆستاڵەكەی ئەتاتورك ماچ بكەم‌و بڵێم :
–باوكە
خۆزییا لەنوتفەی شەیتان بووبام نەبا لەتۆ،
خۆزییا لەدڵۆپێك تاریكیەوە دەتكام‌و
لەپشتی جانەوەرێكەوە دەرژام نەك پشتی تۆ !!
ببینە باوكە،
چەند لەدەنكە شاتووی پلیشاوەی ژێر پۆستاڵەكەی تۆ و
چەند لەبەرچنەی مێوژە ڕژاوەكەی مام زۆراب و
چەند لەنزولە تەریوەكانی ئەو ژنە ئەچم كە بانگی دەكردیت
–پیاوەكە ڕەش داگیرسانی ئەو هەموو یاسەمینەو
گەرم داهاتنی ئەو هەموو نەعنا وەریوانە بتگریٚ،



پروشە پروشە بم وەرێنە
چەند ئەترسم لەساتی هەڵوەرینی گەڵایەكا نەوەرێم و
لەشەوی تەڵقینی وێژدانی سوڵتانێكدا
بۆنی باوكم و ....... ئەتاتورك .. لەیەكتری جیانەكەمەوە،
چەند ئەترسم جامانەكەی باوكم لەگلێنەم وەربدەم‌و بڵێم :
–گەورەم ئەتاتورك،
پۆستاڵەكەی ئەتاتورك ماچ بكەم‌و بڵێم :
–باوكە،
جامانەكەی باوكم لەگلێنەم وەربدەم‌و بڵێم :
–گەورەم ئەتاتورك،
دەینم بەگەردنت گەر شەوێك
بەداوی تاڵێك لەئەگریجەی مەراقمەوەو
بەو هەمووە خەیاڵەپەرت پەرتكراوەی خۆتەوە
لەگەڵم نەیەیتە حەرەم و
تەڕنەبی لەعیشوەی نیگایەكم و،
یەكەمین سەرجێی ئەم نیگەرانیەو
یەكەمین تەوقەی ئەم حەسرەتەم لەگەڵ نەكەی
گەر شەوێك لەگەڵم نەیەیتە گەڕەك و
شەڕە مردن بەتەنیایی و
لەمسەر بۆ ئەوسەری كۆڵان تەڕ نەبین لەنەسیمی باجێنە،
مەراقێك .. دوان ... سیان ..

تۆ هەرگیز ناتوانی پەنجەرەیەك بکەیتەوەو

بڕوانیت بەسەر بێدەنگی ئێوارەیەکداو،

هەڵوەستە لەئاوابوونی هەتاوێکی سەرشێت دا بکەیت ..

نا ... هەرگیز ناتوانی

دەفتەری ئیملای پەپولەیەك بخوێنیتەوەو

ئیعرابی کۆترێك بۆ قەفەس لەیاداشتی سپێدەیەکا بنووسی..

تەڕببیت بەحەسرەتی مێرولەیەك

لەخشەی بێ باکی کابانێکی جرپن دا ..

پیاوەکە

ژیان بتگرێ

کە هەمیشە لەو دیووی نەعرەتەکانی تۆوە ڕەنگە بخەملێ،

پیاوەکە

خۆزییا لەئیبلیس جوتبام نەوەك لەتۆ،

خۆزییا بتکابامایە سەر ڕانی مردنێك و

بەجنێوی پەتی سەگێك‌و سڵم دەربکردبایەو

لەپشکۆ حەملم بگرتبایە نەوەك لەتۆ ..

ببینە باوکە چۆناهی

لەنێوان کەڵلەسەری تۆو هیتلەردا

وەك لیمۆیەکی گوشراو بەپەنجەی ڕاڕاییەکی قوڵ تا دێت

دەپوکێمەوە،

ببینە باوکە چۆناهی لەنێوان خوڕەخوڕەی دەنگی تۆو ئەتاتورکدا



تا دێت چکۆلەترو،

تا دێت غەمگین ترو،

تا دێت تەنیاتر دەبمەوە..

باوکە ببینە چۆناهی،

کۆترێك لەسەر شانی گومەزێك هەڵدەنیشێت،

حەزدەکەم لەسەر شانت

هەڵبکورمێم‌و ناتوانم،

چۆناهی چۆلەکە

دادەوەرێتە سەر دەخڵی جوتیارێکی ناشی،

حەزدەکەم داوەرمە سەر بیرەوەری شەوێکت‌و ناتوانم !!

ناتوانم،

هەم کەڵلەسەری تۆ .... هیتلەر،

هەم خوڕەی دەنگی تۆ ... دەنگی ئەتاتورك،

هەم قەڤ پشتوێنەکەی تۆ و.. هەم پێچی عەمامەکەی مەعاوییە،

لەیەکتری جیابکەمەوە!!

ببینە باوکە،

چەند ناشیم،

چەندە دەبەنگانە خەنجەرەکەی حەرمە لەهەڵدەگرم و

وا دەزانم ئەوەکەی برا شەهیدەکەمە،

براکەم بەر لەوەی کەڵلەسەری خۆی لەتاقی دیوەخانەکانی

ئەفراسیابدا هەڵبواسێ و

بەر لەوەی کراسە دڕاوەکەی وەك شاهیدی کوڕێکی جەربەزە

بنێرێتەوە بۆ دایکم

لەسەر پاشماوەی پەڕی کۆترە سپییەکان

بەخوێنی ڕیشۆڵە تەڕەکان نوسیبووی:

ئەزانی خوشکێ،

شەرەف شەهید بوون

یانی هەڵپڕوسکاندنی ناز نازە غەریبەکانی ماچ و

یانی تکاندنی کچێنی مانگ،

یانی بێ حورمەتی کردن بەنەسیمی باخچەو

یانی تێکدانی ڕێڕەوی شنەبا،

شەهادەت،

واتای لێك جودا نەکردنەوەی باکوری تەنهایی و باشوری شێت

بوون،

دابەش بوونە بەسەر کۆلکەی هاوبەشی خیانەتداو

بردنەوەی کەلـلەسەرێکی زلـترە بۆ سوڵتان !

دەرهێنانی هەردوو گلێنەی شەوێکی ئارامترە بۆ حەللاج و

داوەڵینی خەندەی سیگاری مناڵێکی شەرمنۆکە

بۆ مەزەی مێزێکی ڕازاوەتر ..

شەرمەندەنیم،

دەستم هەیە لەکوشتنی یەکەمین وەنەوزو

دەستم هەیە لەداوەرینی یەکەمین هەناری پێکەوەبوون و



دەستم هەیە لەپەڕاندنی یەکەمین دڵۆپە شەهوەتی

جەنگ لەخوێن و،

دەستم هەیە لەئەنفالی پێکەنین و

لەئەنفالی موحیبەت و

لەقاقڕی سەدان وەرزی گوڵ گوڵین و

لەخنکانی یەکەمین ئینجانەی مەرحەمەت

لەدوا تاقی ئاوێنەبەندی لێبوردن،

دەستم هەیەلەسوتانی

یەکەمین کتێبی نێو ڕەفەکەی حامورابی و

هەروەها دەستم هەیە لەبێ بن کردنی یەکەمین هەتاو و

لەدامێنی ئێوارەیەکی بێ غیرەتدا،

لەکوشتنی یەکەمین خوشکدا کەتۆیت

(براکەم شەهید بوو نەپیەرژا بم کوژێ)

هەرچەندە ئەشی زانی،

شەهیدبوون

یانی هەڵفڕاندنی کۆترێك

لەگوێسەبانەی چۆڵترین حەوشدا،

یانی دار هەڵدان بۆ شەمشەمەکوێرەیەك کە هەرگیز نایەتەخوار !!

یانی تەقەکردن لەعەمامەکەی (مەحوی) گەورەو،

یانی دزینی گەنجینە زەخمەکانی (قارون)

بەتالان بردنی چروسکەی خەونی وەریوو و

چەپکەچپکە گوریسی پرچی ڕناو و
جریوەجریوە پێکەنینی تەکێنراوی کەنیزەکانی
(هارونە ڕەشید) ..
یانی شەوکوتی کردن لەعەورەتی سنەوبەر ..
یانی تێکدانی نەخشەی ماتماتیکانەی ئەندازیارە بچکۆلەکە،
یانی بەدرۆ خستنەوەی مام خدر
لەپێناسەی کوێرە پەزێکی ئیفلیج دا ..
(براکەم شەهید بوو نەیپەرژا بم کوژێ)
هەرچەندە من هاوارمەکرد
کە هەمیشە مردن‌و ژیان
دوو گەمەی هەرە دۆڕاویی خودان !!!
( براکەم شەهید بوو نەیپەرژا بم کوژێ)
خۆزییا دەیکوشتم‌و نەدەبوومە بەندەواری ئەم هەموو حەسرەتە،
نەدەبوومە ڕەمیدەی جرپنی ئەم هەموو نائومێدیە
تای ئەم هەموو نیگەرانیە نەیدەگرتم،
لەژێر لێزمەی ئەم هەموو بارانی حەسادەتەو،
بەدلۆپەی ئەم شۆرتە هەڵ نەدەکورمام،
منێك کە بەسەر قەتڵ‌و عامی خۆما هاتبووم،
هەڵکەوتووم لەو هەموو تلی حەیسیەتە،
لەپێخەفی ئەو هەموو قاتڵە گەورەیەدا نووستوم،
ژانم بەتوفلی قاچاخچیە زۆڵەکان و



ژانم بەوەچەی مردنێك گرتبوو لەنوتفەی چەقۆ،
مەمکی خۆم لەزاری ئەو هەموو پشکۆیاو،
چاوی خۆم لەسەیرکردنی ئەو هەموو پەیکەرانا لەخوێن،
وای لام دایەسەر چەند ڕەزی جەراعەت‌و
بێشکەی چەند عەزابی نوستووم
بەشریخەی برژانگ ڕاژەند،
کەچی واخەریکە،
مەرگی پەپولەیەك لەلێواری شینی شەمعێکداو
ڕەقبوونەوەی ئاسکێك لەدڵی ساردی بەندۆڵێکداو
تەرمی بێ وادەی مینایەك لەلێواری جۆگەلەیەکداو
هەڵگەڕانەوەی لاو لاوێکی ڕەش داگیرساو لەقیافەی دیوارێك و
دەرهێنانی دەنوکی کەناریەك لەپەنجەی مناڵێکی گرۆزداو،
هەڵگرتنەوەی گلێنە تاکەو تاکەکانی بەبوویەك،
لەدەخیلەی یادەوەری ڕاوچیەکی کاڵفام دا ئەمکوژێ!!
(براکەم شەهید بوو نەیپەرژا بم کوژێ)
مرادخانی‌و سەبیلەکەی لەخەونی بەتاڵی شەوێکداو
لەپرخەپرخی باوکێکی بەغەزەب حەواڵە بوودا ناردەوە بۆ برا
بچوکەکەم،
ئەو برایەی هەر لەچرکەی ترازانەوە دوو سەرو
هەر لەچرکەی تەماشاوە چوار چاو و
هەر لەچرکەی دارەدارەوە چوار قاچ و

هەر لەچرکەی لێکردنەوەی یەکەمین هەناردا چوار دەستەو
باوکە دەیگووت :
برا شەهیدەکەت دەڵێ:
مانەوەی ئەم کچە نەفرەتیە درزێکە بۆ دیواری کەرامەت و
خوێنێکە بۆ تەوێڵی پیاوەتی،
کتێبی تەمەنێك لەپەشیمانیمان پێ ئەنووسێ،
شەرابی شەرمەزاری وەرزێکمان لەفەتارت پێ ئەنۆشێ،
برای بچکۆلەوەك کوڕی ئێوارەیەك لەنەهامەتو
کوشتەی قەدەرێکی لنگەو قوچ
بەزمانێکی شکاو دەیگووت:
من هەرگیز نایکوژم خوشکێ
بۆنی بەرامەی پاش باران و
بۆنی ڕەشەڕەیحانەی بن جۆگەلەی کچە قەیرەیەکی پۆشتەو
بۆنی گۆپکە قارچکێکی هەڵتۆقیووی بن پەیژەی دەوار نشینێو
شەمامەی بێستانی لێ دێ.
بەیدەبا چەند ئەترسم،
بۆنی باوکمو
بۆنی ئەتاتورك لەیەکتر جیانەکەمەوە،
چەند ئەترسم پۆترەتێتی نیتشەو...
سکێچی برا سەقەتەکەم لەیەك گلێنەدا کۆ کەمەوە،
بەیەك ئیحا جریوەی وەریووی گۆرانیەکانی هاوڕێ قاتڵەکەم



نەرمە مەقامی تاساوی ئەو پیاوە گەنم ڕەنگە بڵێمەوە،
کە لە ئێوارەپایزێکی زەردتر لەگۆنای دڵنیایم
لەچڕە دوکەڵی ترس و گوماندا ونم کرد ..
بەیدەبا ... بەیدەبا
من لەکوێی ئەم قوڵاییەدا دانیشتووم،
لەکوێی ئەم بۆشاییەدا بیر دەکەمەوە؟
جەبریەتی چ قەدەرێکی پەژموردەو
پەلی چ ئەهریمەنێکی نازەنین
بۆ کرۆکی ئەم جەنگەڵەو
بۆ نێو کۆشی ئەم هەموو ئەفسەرە خیزلەی فڕێداوم .
لەسەر کەڵەپشکۆی ئەم هەموو ڕاڕاییە ستاری پێگرتووم ..
بەیدەبا ....
ئەم هەموو خەنجەرەچی بوون لەمنا هەڵتۆقین و
ئەم هەموو منەچی بووم
لەم تارماییانەدا چاوم کردەوە؟
ئەم هەموو سێبەرە چی بوون
لەتەماشام هەڵزنان و
ئەم هەموو ساچمەیەچی بوون لەپیاسەی پێڕەکۆترێکی ئارەزووما
هەڵسانەوە..
تەماشاکە بەیدەبا ....
ئەم شەوە چۆن یاری بەتەنهایی و

ئەم تەنهاییە چۆن یاری بەتەمەن و
ئەم تەمەنە چۆن یاری بەیەقین و
ئەم یەقینە چۆن شەق لەوجودم هەڵئەدات ..
بەیدەبا..
چەند حەزدەکەم شتێك لەزمانی شەپۆلەوە فێربم
تا لەوەزیاتر دەنکەچەوی ئەم سرەوتنەم ڕانەماڵی..
شتێك لەفەرهەنگی گڤەبادا دەرخ کەم
یا لەوە زیاتر تەعەدا لەبێدەنگی گەلاو
لەبیرەوەری ئەو هەموو شەمعەو
لەسکوتی ئەو هەموو فانۆسەپێکراوانەی ئۆخژنم نەکات .
ئاشنابم بەزمانی جەهەندمێك
یا لەو پەڕی بێداڵدەییەوە داڵدەم بات!
منێك فیکرەی ئێوارەیەکی سەقەت بەچۆکیا هێناوم و
لەسەر نوکەپێی شەیتانێکی بودەڵەدانیشتووم .
وەك پشیلەیەك بەنۆرۆ هەڵلەرزیوو
وەك شابانوی سەر کورسیەك لەبەستەڵەك دەم داچەقیوو!!
تکایە بەیدەبا.
ئەگەر دڵۆپێك لەڕووناکی دنیا ماوەتەوە پێمی بەخشە،
ئەگەر تنۆکێك لەحەقیقەت لەکاسەی ئەم کۆدیتا شکست هاتوانەدا
چاو دەکەیت،
بیەڵە بەم زاکیرە ڕووت کراوەو



بەم عەقیدە تاڵان کراوەو
بەم نیگا فەرەود لەهەموو جوانیەوە بیبینم..
وای چەند ئەترسم
ئەمە دوا ونبونو دواکایە بێ لەیاریەکدا،
کە من بەدۆڕانەکانیەوە موتوربەکراوم..
چەند ئەترسم چاویلکە بزربووەکەی نەنکم
لەفەشەلی دیتنما نەدۆزمەوەو،
سەرم لەئاشوبی ونبونێکدا،
نەدەمە دەست حیکایەتی شەوێکی ترو
شمشاڵێکی تر لەبیرەوەری ئەو هەمووە ڕەنگە پەڕیوە لەئەدگارماو
ئەو هەموو خوێنە ڕژاوە لەلەپ ماو
ئەو هەموو قامچیە لەئیرادەماو،
ئەو هەموو پێکەنینە کوژراوە لەلێوماو
ئەو هەموو وشە تیرۆرکراوە لەکتێبی وتنم داو
ئەو هەموو نەزەرە نووستوە لەچاوما نەژەنم ..
ئەترسم کە نەتوانم
سەرم لە ئاشی بای ئەم جەنگە دەربهێنم و
لەئیستوای خەیاڵی ژیان
بەدوای ڕەنگەکانی ئەو شێوەکارە یاخیەدا بگەڕێم
کە دەیگووت:
(بەختەوەرە ئەو کەسەی کە خودا لەیەك ڕەنگاو،

مردن لەیەك ڕەنگا ئەبینێ)
نەهامەتی گەورەی من لەوەوە دێ نەمتوانیوە
هەمیشە لەباڵی پەپولە نازکی و
هەمیشە لەدڵی دەمانچا ملولەی باروت و
لەشریخەی خەنجەرەکەی باوکتا شەهامەت و
لەدوا وەسیەتی برا شەهیدەکەتا حەقیقەت و
لەمەودای یەك دێرا تۆ وەك درزێ بۆ دیواری کەرامەت و
وەك خوێنێك بۆ تەوێڵی پیاوەتی بتبینم ..
وای بەیدەبا،
چەند درەنگە لەزمانی ئاگرەوە شتێك ببیسی و
چەند درەنگە بەو هەموو دەنگە لەگۆکەوتووەی بێدەنگی کۆترێکا
شتێك لەحیکایەتی گمە بلێیتەوە،
من هەمیشە پەنجەرەیەك دەکەمەوەو پەنجەرەیەکی ترم لێ عاسی
دەبێ،
دەرگایەك دەکەمەوەو و
دەرگایەکی ترم لێ دێتەوە سەرچۆك،
خەنجەرێك لەزمانما ئەتوێنمەوەو
خەنجەرێکی دیکە لەڕۆحما ئەپشکوێ ..
حیکایەتێ دەگاتە سەر لێوی وتنمو
حیکایەتێکی دیکە وجودم ئەکرۆژێ،
لەپرچ شەماڵێکی عەیاردا ڕائەکشێم و



گەردەلولێکی بێ باك پێم ئەڵێ:
تف..
دەڕژێمە سەر ڕدێنی گەردەلولێك و
شەماڵێك پێم ئەڵێ:
نەعلەتی ....
بەیدەبا ..
چەند حەزدەکەم جیهانێك بخوڵقێنم لەنەعلەت،
مناڵێکی تر بخەمەوە لەتارمایی،
گرنگ نیە دەجال بێت یان مەسیح،
ڕەخشەکەی لەشەو بێت یان لەتریفە،
قوماتی لەپشکۆیەیان نێرگز،
بۆنی لەئیسپرتۆیەیان نەعنا،
من مناڵێکم ئەوێت
شەو بهێنێتە سەر ئەژنۆ و
ئاسمان لەبێدەنگی هەورێکدا زەخرەفەکات،
دوا ئایەتی پێغەمبەرەکان لەگومانێکا هەڵباتەوەو
دوا شەوی سۆزانیەك لەبەرائەتی مەریەمدا هەڵبواسێ و
جەنگی منو حیکایەتی ئەم ونبونە
قوماری ئەم فەتارەتە لەپێکێکدا بخواتەوە..
گرنگ نیە ئەم حەملە لەتاریکی ئەگرم یان لەنوور،
گرنگ نیە شەیتان ئەخەمەوە یان فریشتە..

**من مناڵێکم ئەوێت**

**فەزایەکی دیکە بنێتەوە لەدەنگ!**

**شەوێکی تر بێنێتە زەلزەلە..**

**چش بەیدەبام،**

**با ئەم گەمەیە دواگەمەو،**

**با ئەم ونبونە دوا ونبون بێ لەکایەیەکدا**

**کە من لەئەزەلەوە بەدۆڕانەکانیەوە متوربەکراوم** .............؟!!

**پایزی** 2003



## (سەرسامییە وەهمیەکانی ژنێکی تەنیا)

بۆ هەموو ئەو ئێوارانەی فرسەخێکیان تیا نەماوە بۆ ئارامبوونەوە
بۆ تۆ بەتایبەت تۆ ئەی ئەو ژنە مەرگ پۆشەی لەودیوو
دەریاکانەوە دەخوازی پشوویەك بەی ..



ئەو بەگومانەوە دێتەخوارێ و
ئەو بەبێزارییەوە تێم ئەڕوانێ
ئەو ڕۆژمێرییە پایزییەکەم هەڵدەداتەوەو
ئەو لەشڵەژانەوە پێم ئەڵێ:
ئەی نەعلەت
تا تەلارێك بۆ ئۆخژن بوونەوەی
هەناسە دوورەکان هەڵ نەچنی لێم نزیك مەبەرەوە،
تا دڵی پەپولەیەکی پیر نەدەیتەوە لێم مەڕوانە
تا ئێوارەباشی ئەو قەیرەکچانەنەسەنیتەوە
خەنجەر لەدوای خەنجەر بۆن بەخوێنەوە ئەکەن لێم مەڕوانە..
تا سوڵحی نێوان دوو منالی قەزەم و
یەك نیشتمانی سەد پارچەو
کوڕوزانەوەی دوو عاشق و
شێت زادەو ژیر بێژێ نەکەی،
ئەو پێم دەڵی:
ئاشت بەرەوە لەگەڵ خۆت
من فێردەوسیترین دەرگاکانی خۆمت بۆ ئەکەمەوە،
من ئەڵێم:
(واتای خوڵقاندنی گەورەترین گەڕەلاوژە)
ئەو دەڵێ:
تا ئاشت نەبیتەوە لەگەڵ ڕوانینەکانت.

ئەو دەڵێ:
گوێی لەقریشکەی ئەو تفەنگانەمەگرە
کە مێژوویان درێژ کردەوەو
ئایندەیان بەهەناسەیەك پێکا.
تەعەدایان لەمێینەتی ماکەوەکانمان کرد،
گوێی لەگیڤەی ئەو کێبڵانەمەگرە
کە جەستەی کیژۆڵە شەرمنەکانی منیان قاشق قاش کرد،
ئازار ئازار نەزیفی مردنیان لەبێوەژنەکانمان بەردا،
گوێێ لەخوتبەی ئەو پیاوە ماسۆشیانە مەگرە،
کە لەپشت میمبەرەکانی ئاسودەگیەوە،
سەرخۆش ئەبن بەشەهوەتی ئەو ژنانەی
کە تریفەکانی خودا بەڕوخساریانەوەدیارە،
شەوانە خۆیان دەخەنە باوەشی ئەو سۆزانیانەی
کە ڕۆژانە بەنەفرەتیان دەکەن و
خەنجەرەکانی مەحشەر بەڕوویاندا هەڵدەکێشن،
کەدەگەنەسەر بەردێکی ئیماندار
بێدەنگ دەڵێن:
(سڵاوی خودامان لێ بێت هەرخۆمانین ئەهلی ئیمان)
ئەو پیاوە ئایدیابازانەی هەر ڕۆژە نیقابێ ئەپۆشن و
هەر ڕۆژە تەوێڵی درۆیەکی زلتر ماچ دەکەن،
درۆیەك گەورەتر لەمردن،



نابێت ببێت سیمناری ڕوئیەتەکانی منەوە،
من دەڵێم:
ڕوانینی ڕاستەقینە کامەیە فێرم کە؟
ئەو دەڵێ:
نەخوێندنەوەی کتێبە خورافیەکانی جەهەندم
سەیر نەکردنی درامایەکە کە دەتباتەوە
باوەشەکانی ئەو دنیاو
کزەباکانی سپێدە قانگ دەدا بەتاعونەکانی وەرین،
من دەڵێم:
(گوناهی من نیە زەمەن خۆی پێ بەپێی ببێهودەیی ئەڕوات)
ئەو دەڵێ:
نابینابی باشترە لەوەی تەنها قەسیدەکانی چاوەڕوانی بخوێنێتەوە،
تەنها باقو بریقی ئەو ئەفلامانە چاو بکەیت
کە فرسەخێکی تیا نەماوە بۆ ئارام بوونەوە،
من دەڵێم
گوناهی من نیە چاوەڕوانی بەشەمیراتی ئینسانە.
بریقەبریقی خەنجەرو
تا فەتاڤی مەرگ
زەرد هەڵگەڕانی هەناسەو
بەنەفرەتکردنی مانگ،
بەهەمووماندا بەشراوەتەوە..

ساختەچی تر لەژیان،
درۆیەك جوان وەك هەناسەی سەدەفەکانی کەنار
درۆیەك جوان وەك خەنینی ئاورنگ،
درۆیەك مەستتر لەپاڵدانەوەی دەنکە زیخێك بەدڵی لاپاڵەوە،
من دەمگووت:
(خەتای من نیە
ئەوە هەناسەی ئەژدادەکانمە دادەچۆڕێتەوە ڕۆحم
ئەوە شعوری باوانمە چێژ لەئەتککردنی ئارامیەکانم وەردەگرێ)
هەر ئەوە وادەکات چاوەڕوانی دوا ماڵی نائارامی هەموومان بێ،
ئەو دەڵێ:
وەرەدەرێ ئەی ژنە سەرکەشەکە،
بەپێلەقەکانت دەنکەترێی ئەم چاوەڕوانیە بپلیشێنەرەوە،
من دەڵێم:
(ئامان چاوەڕوانی جوانترین بەهانەیە بۆ ژیان)
ئەو لەسەر ڕووبەری تاکەکەم دێتەخوارێ و
زەرب بەسەر ڕۆژەکانی خۆیدا دێنێت و
بەحەسرەتەوە دەڵێ:
چاوەڕوانی واتای لەسێدارەدانی هەموو حەزێ!
چاوەڕوانی واتای تەقەکردن لەمانگەشەوی ئاسودەگی،
چاوەڕوانی واتای هەڵکێشانی تیژترین شمشێر
بەسەر شەونمی گوڵە پاتۆنیاکانی ئارەزوودا،



واتای بێبینایی کردنی ئەو دایکە شەوپۆشانەی
کە لەجەهەنەمەکانی بێهودەیدا ژیان،
چاوەڕوانی واتای خنکاندنی ئەو مێینانەی
کە دۆستەکانیان چونەسەفەرو
لەودیوو گومەزەکانی مەنفاوە
باوەشێك مردنیان بۆ ناردنەوە
کەشکۆڵێ بێوەفاییان لەدوو توێی فاکسێك و
لەزرینگەی تەلەفونێکدا ئاودیوو کرد،
من گووتم:
(ئای ئەمەیە جەنەتی سەفەر)
ئەو دەیگووت
بێدەنگ بەژنە نەفرەتیەکە
بەر لەوەی تۆ لەوپەڕی بێزارییەوە ڕەشم کەیتەوە،
با من لەناو نەهلیستیەتی تۆدا بمرم،
تۆ یەك کە ناتوانی،
لە شەممەیەکی مندا ماڵێك بۆ کۆترە ئاوارەکان دروست کەیت،
دڵی کوکختیەکی شکست بهێنێتەوە سەرخۆ،
لێم نزیك مەبەرەوە
تۆیەك جورئەتی ئەوەت نیە،
لە یەکشەممەیەکی شەڕانیدا،
هەناسەی نارنجۆکێك ئارام بکەیتەوەو

فەزایەکی دی بخوڵقێنی بۆ پرسیار!
تۆیەك جەسارەتی ئەوەت نییە
لە دووشەممەیەکی شڵەژاوا
ئەو دووشەممانەی کە جەنگ پێ بەپێی ڕەوڕەوی مناڵەکانمان دێ،
تەجرەبەی شۆڕشگێڕە پیرەکانمان دەدزێ،
لەبری پیاسەو سەمای بۆنکردنی جوانییەکان
لاوە باڵق بووەکانمان
دەباتە سەر کەوسەرەکانی خوێن و
خورەخوڕی مردن لەسەریان بەردەداتەوە،
ناتوانی ئەو دووشەممە مەلولانە ئاسودەکەیت،
مناڵەکانمان بەریتەوە سەر بەزمە خۆشەکانی ماتانێ و
تەجرەبە بەیتە دەست حەکیمەکان،
شەقاوی عیشق نیشانی ئەولاوانە بەیتەوە
کە ڕۆژێك لەنێو چاوییان نەنوسرابوو ئاسودەبن،
بڤە ئەزیزم
تۆ کە ناتوانی دەست بۆ هەنسکی سێشەمەیەك بەری،
ئەستێرەیەکی تیا هەڵ نایە بۆ شەوە بێ کۆتاییەکان،
ئاوازێکی تیا نییە بۆ لاواندنەوەی ئەو ژنە جەحێڵانەی
کە لەسەقەرەکانی تەنیایدا یەك یەك قرچان،
بالآیان چنار چنار
لەنێو پەڵە هەورەکانی شێتبووندا دوا گەمەیان کرد،



قەف قەف ئەنفال لەپاوەتا گەردنیان ئاڵان،
من هیچت پێ ناڵێم ئەی ژنە بێباکەکە هیچ،
تەنها لەسێشەممەیەکی بێ مروەتدا سمبولی سەوزبوونەوە بەرەوە
دەست
گوڵەژاڵەیەکی بێ ڕەونەقی باخچە مەحزونەکانی هەڵەبجە،
لێرە هەوڵی ونبوونی من مەدە،
حەیفە گەر گەمەیەك لەگەڵ ژاکانی ئەو مەهوو پرچانا نەکەی،
حەیفە تروسکەی هیوایەکت بۆ نەفەسی ئەو ئێوارە شکستانە پێ
نەبێت،
بە مشارەکانی بێزاریت بێهودەدار مێوەکانی جەستەم ببڕیتەوە..
تکایە لەچوارشەممەدا،
توخنی خەمە ئەبەدییەکانم مەکەوە
لەچوارشەممەدا هەوڵی پرکردنەوەی فەراغەکانت مەدە
ئەو فەراغانەی هیچ زەمەنێ پڕی نەکردونەتەوە،
هیچ ئەندازیارێکی وریا خشتێکی لەلەپی خۆشبەختی بۆ
دانەناون،
هەوڵ مەدە نهێنیەکانی ئەوبەر مردن بخوێنیتەوە،
هەر چۆن هەوڵ نادەی تەزووی ژیان بەو قەیرە کچانەدا
ببەخشیتەوە،
کە تا هەنووکەش بەڕووی هیچ ئاسودەگیەکا نەبزواون و
هیچ تروسکەیەکی ئارام پێی نەگووتون

(بەیانیتان باش ئەی عەشیرەتی بێ کەسان )
من گووتم:
ئاهە چ بێ باکیەکە ئێرە،
ئەو وتی نا لێم مەیەرەپێشەوە،
ئەی قەرەچ
تۆ کە ناتوانی لەپێنجشەممەیەکی فریاد رەسا،
هەلاڵەی هەناسەی ئەو عاشقانە بەیەکا سەربخەی
کە هیچ تریفەیەك زەماوەندی نەگێڕاون،
هەر هێندە لەپێنجشەممەیەکی موحیبەت ڕژێنا
جەستەی بریینداری فەیلەسوفێکی عاشق خاوکەرەوەو
نۆبەرەی هەیکەلی (کۆزیما) لەڕەنگەکانی ڤاگنەر دەربهێنەو
بیدەرەوە دەست حەزە سەرکەشیەکانی نیچەو پێی بڵێ:
ئای گەورەم مرۆڤ لەشیت بوونا چەندەجوانە،
چەند بێ حەوسەڵە لەسەر بالیفی ئەو پێنجشەممانە دەخەویت
خەتەرەیەك لێ نادەی بۆ تەنهایی ئەو عاشقانەی کە لەبیابانەکانی
نامورادیدا بەسەراب خنکان،
ئەو عاشقانەی تامی هیچ شتێکیان نەکرد تەنها
پرتەقاڵەکانی نامۆیی نەبێ،
شەوێك زولێخای میسر هەڵسێنەو پێی بڵێ:
ئەوە قیافەی شاهانەی یوسفە
لەبیرە قوڵەکانی کەنعان بەبێدەنگی گەڕاوەتەوە



تەنها پێنجشەممەیەك،
بەهەناسە ڕووتەکانی قەیس بڵێ:
من دەتوانم
ئێوارە تاساوەکانی لەیلا
لەمەرزەکانی تەنیایتدا بژێنمەوە،
من گوتم :
ئاه چ ساوزی بوونەوەیە کە ئێرە، ئەو کۆتا ئاوڕی لە
حوزنە ئەبەدییەکان دایەوەو،
بێدەنگ بێدەنگ،
قەڵەمەکەممی شکاند،
لەسەر نێوچاوانم نووسی:
لەهەینیدا خۆت بکوژە،
خۆت بکوژە ژنە نەفرەتیەکە،
خۆ کوشتن جوانترین بەهانەیە بۆ ژیان
ونبون جەنەت ترین ژیانە،
من بە باوەشێك دووکەڵو دوولاقی ئیفلیجەوە دووی کەوتم،
هاوڕێ کەم بەدەم ژەنینی کەمانەکەیەوە هاواری لێدەکردم،
(کچێ مەڕۆ دنیا دڕۆزنترین جوانیە،
بەختەوەریی ئەفسانەترین گۆرانیە)
هاوڕێ نووسەرەکەم دەیگووت:
(ئاسودەگی لەماتماتیکەکانی دنیا
بێکەسترین ژمارەیە)

هاورِێ شاعیرەکەم دەیگووت:
(کچێ وەرە با لەوسەری ناڕێکیەکانەوە
قەسیدەیەك بۆ شکستی ئەو نەوڕەسانە بنوسین
کە کەنارێکی بێ وەفا خیانەتی لێکردوون و
شەوانە بە نەفرەتیان دەکات:
کۆتا دەنگ لەو دیووی ژێیەکانی بیستنمەوە ئەهات دایکم بوو
ئاه دایکم،
هەنسك هەنسك دەیگووت:
(کچێ مەڕۆ،
تۆ چیت لەو گەڕەلاوژەیە دەوێ،
ئاوی ئینجاناکان دێرە،
بۆشاییەکان بە بەتاڵی بیەڵەرەوە،
بگەڕێوە
کچە جوانەکەم

بگەڕێوە........................

2002



**(شیعرێك ئەتوانێ ئەو ژنە ئاشت كاتەوە كە دڵی داوە بەرەشەبا....)**



**گوناهی كامان بوو سەوداگەر**

**گوناهی كامان بوو،**

**تۆیەك كە چەشنی یاقوتێ كەوتبویتە سینەی تەنهایی منەوە،**

**تۆیەك لەخەونی بەتاڵی شەوێكاو**

**بەداوی تەنكی ئومێدێكی ڕوتەڵەوە،**

**چاكەتەكەت دەدا بەشانی هەتاواو**

**ڕدێنت بەئەستێرەكان دەشت ..**

**گوناهی كامان بوو مانەوە؟**

**تۆ كە بەتاقی ئاسمانەوە وەك مانگێكی چوار پەل بەسراو**

**بانگت دەكرد،**

**تكایە ماتڵی كەن با نەڕوات،**

**شیعرێك ئەتوانێ ئەو ژنە ئاشت كاتەوە،**

**كە شەو لەحەژمەتی دەكرێ،**

**تكایە ماتڵی كەن**

**تكایە بەنوور چاوەكانی ببەسنەوە**

**با ئاورنگ شەفافترین گۆرانی بۆ بڵێ،**

**گەزۆی دڵ لەزاریدا بتوێننەوە،**

**تكایە شەرەتیشكی لەگەڵ بكەن بانەچێ،**

**تریفەی بۆ بكەن بەرچاكار**

**نێرگز بوەرێننە بەر پێی،**

**شیعرێك ئەتوانێ ئەو ژنە ئاشت كاتەوە**

كە دڵی داوە بەڕەشەباو نەزەری بەخشیوەتە ئاگر،
كە دڵی داوە بەڕەشەباو پەنجەكانی لەماڵی جاڵجاڵۆیەكی بەغیلدا
خەونە مزرەكانی بەرسیلە ئەنوسێتەوەو
خەیاڵی سمۆرە كوێرەكانی بەختەوەری،
لەپوچی گوێزەكانی ژیان مەحف دەكاتەوە،
شیعرێك ئەتوانێ ئەو ژنە ئاشت كاتەوە
لەتەمەن تەنهایی پێ ئەكاو
لەتەنهایی ژیان ئەبەخشێتەوە،
(ناخودا) ئەو ژنە ڕژاوە كۆكەرەوە،
(ناخودا) تەڕیكە ئەگریجەی بەشەپۆلان و
گەردانەی مرواری بكەرەوەگەردنی و
بیبەرە كەشتیەكەی خۆتەوە،
دەلیلی ئەو ژنە بە لەدەریا تا دەگاتەوە كۆڵانی پاتۆنیا
دیوەخانی تۆز گرتووی گوڵە لاولاوەكان،
دەلیلی ئەو ژنە بەناخودا،
كە قسەیەكی جوانتری هەیە بۆ ئینسان و
خەوەكەی گەورەترە لەدنیا،
تۆ دەتگووت :
–خودایە بپارێزە ئەو ژنە
پەنایی دە لەشەڕی شەیتان،
دایكم دەیگووت:



–خودایە بپارێزە ئەو تفڵە پەنایی دە لەفیتنەی ئاخر زەمان،
(مەستوورە) وەك ساقی گوڵەبەڕۆژەیەكی هەڵچوو
نێوچاوانی بەئاوابوونی هەتاو بەردەدایەوەو
دەیگووت :
–خودایە بپارێزە ئەو خوشكە،
پەنای دە خودایە لەعیشقی ناگەهان،
لەخەونی بازنەی بەتاڵ و
لەنووسینەوەی قسەیەكی كرچو كاڵ،
خودایە پەنای دە ئەو ژنەی
بەدەم هەڵكردنی تاریكیەوە
بیر لەكۆكردنەوەی گۆرانی شەمشەكوێرەكان ئەكاتەوەو،
چەشنی دەلاڵێكی كارامە
نامە بەهارییەكانی ئینجانە بۆ هەتاوو
نامە شپرزەكانی شێتبوون بۆ بەختەوەری و
نامە خەزانیەكانی تەنهایی بۆ نائومێدیی و
نامە خوێناویەكانی جەنگەڵ بۆ عەدەم دەبات،
خودایە پەنایی دە ئەو ژنەی بەناوی پەپولە خێڵەكانەوە،
پۆستەرە شیعری چكۆلە بۆ گوڵەمیناكان ئەخوێنێتەوەو
لەزمانی بولبولەوە بەقەفەسەكان ئەڵێ:
بەقوربان یەكەمین تەعاروفی منو تۆ
وەرزی چ تڕۆبونێك دەكات،

ئەو دەستەی پێشبینی پێگەشتنمانی کرد
دەستی خوێناوی خۆمان بوو،
یان پەلێك لەدەرەوەی دنیا ؟!
ئەو هەمیشە دەیگووت:
من خەیاڵە ئاوییەکانی شوشە ڕەنگ ئەکەمەوە بەر لەشکان،
داڵغەم بەنووسینەوەی خەونی مامزێك ئەفرۆشم
بەر لەکەوتنە فرسەتی ڕاوچییەکی گرگنەوە،
گلێنە قورسەکانی ماسیەك ئەخوێنمەوە
بەر لەوەی بەقولاپی ماسیگرە کاڵفامەکانەوە بێ،
دەفتەری ویژدانی پشیلەیەکی بۆز هەڵدەدەمەوە
بەر لەبردنەوەی کەروێشکێکی ناباڵق،
(مەستورە) وەك شازادەیەکی عەیار
خەمسارد لەغەرەزی ژنەکانی خەسرەو ناکام،
ئەگریجەی بەخۆرەتاو دادەهێناو
کریشمەی پەرچەمی بەگوڵاوی ڕێحانەکان تەڕدەکرد و
بەدەم بوغزاندی حەبیبەوە
چاوی لەحیشمەتی دادەگرت و
غەزەلە شەیتانیەکانی نالی دەخوێندەوەو
بەهەمان دەنگی نیان هاکەزاییانە دەیگووت:
خودایە پەنای دەلەعیشقی ناگەهان،
لەخەونی بازنەی بەتاڵ و



لەنووسینەوەی قسەیەکی کرچ و کاڵ ...
سەوداگەر گوناهی کاممان بوو،
تۆ کە بەتاقی ئاسمانەوە بانگت دەکرد :
شیعرێك ئەتوانێ ئەو ژنەئاشت کاتەوە
لەگەڵ ئەستێران جووت دەبێ و
مناڵ ئەخاتەوە لەچەشنی تریفە،
ئەو ژنەی لەبەرائەت حەمل دەگرێ و
کچ دەخاتەوە لەڕەگەزی هەنگوین،
کوڕ ئەخاتەوە لەوەچەی نوور،
دنیا بەگوڵاو ئەشۆرێ و
شار پڕ دەکات لەشەمامەی بێستان،
تۆ دەتگووت و دەنگێك لەتوخمی دایك هاوارەکانتی هەڵدەمژی،
تۆ دەتگووت و
ئەو دەیگووت:
کوڕەلاو
بێ منەت لەمەرگی من بەم شەوە عاشق بووی بەکێ؟
کوڕەلاو
شاعیرە ئەسمەرەکە
خەمسارد لەتەنهایی من
عومرت هەڕاجی چ ژن قەرەچێکە؟
کوڕەلاو،

چیت لەجەنگی ئەو ژنە سەرخۆشەدەویٚ
کە مەستە بەشیعرێکی تەڕ
کە هەمیشەدڵدەدا بەڕەشەباو
نەزەری بەخشیوەتە ئاگر....
کوڕەکەم ئەو نەشرینی ئەرمەنەو نەلەیلی عامر شا
نەمەریەمی موقەدەسەو نەفاتیمەتو زەهرا،
نە شار پردەکات لەشەمامەی بێستان و
نە کوڕ دەخاتەوەلەچەشنی نوور،
تۆ دەتگووت و
ئەو دەیگووت
من دەمگووت،
ژیان وەك قوتابیەکی سەلار بەقامکی شەهادەتی هەردوو لێوەکانی
دەبەستەوە...
من دەمگووت و
مەستوورە
بەهەردوو لەپی دەست توند گوێیەکانی دەگرت و
وەك بێوەژنێکی ناشاد،
تەنهایی خۆی ئەخستە ڕستەوە،
لەپەراوێزییا ئەینووسی:
نالیا بڕوانە چ مەحشەرێکە ئەم ژنە،
بڕوانە چۆن دڵی داوە بەڕەشەبا



نالیا لەکوێیە بادی خۆشمرور،
شیعریٚ ئەتوانیٚ ئەو ژنە ئاشت کاتەوە
کە کەللەی چڕترە لەدارو موڵکی بابان و
دڵیشی گەورەترە لەقوتبی شارەزوور،
گوناهی کاممان بوو سەدا گەر
گوناهی کاممان بوو؟
تۆ کە هەرگیز نەت توانی چاکەتەکەت لەهەتاو وەرگریتەوەو
بەمانگ بڵێی:
بۆ شەوێك بۆینباخەکەتم بەریٚ و
ژنێك لەپشت گوڵە لیمۆکانەوە چاوەڕێمە،
هەر هێندەی نەفەسی جگەرەیەك شیعرێکی بۆ ئەخوێنمەوە
هەر هێندەی پیٚ گرتنی گەڵایەك بەعەتری هەناسەم تەنهایی
تەڕەکەم،
هەر هێندەی لێکردنەوەی گوڵەباخیٚ
تەلبەندی باغە یاساغەکانی ئیحساسی ئەکەممەوە،
ڕووتی خۆم بەئاوێنە شکاوەکانی گلێنەی دەفرۆشمەوە،
ئەو ژنێکە سەرخۆشە بەشیعرێکی تەڕ،
ئاخر ئەو کە ژنێکە هەمیشە دڵدەدا بەڕەشەباو
نەزەر دەبەخشێتە ئاگر ...............!!

2002



## (سپاردنی ژنێك بەبیرچوونەوە)

پاش بیرچوونەوەم لەگێمەکانی تەنهاییدا بۆ غەمگین کۆساری هاوڕێم
پێشکەشە



سەبووریم بەرەوە ئەی دەریا
سەبووریم بەرەوەئەی تەنهاترین ناخودا،
سەبووری دانەوەی ژنێك
تەنها گوناهێکی هەبوو
پەنجەرەیەکی لەبێدەنگی خۆی کردەوەو،
ئێوارەیەکی لەوتن هێنایەوە ژووری،
سەبوریم بەرەوە
سەبووری دانەوەی ژنێك
بەدڵێکی گەورەوە سڵاوی لەژیان کردو
بەتوڕەیی پێکراوترین مەخلوقەوە
بە بەختەوەری وت ماڵئاوا ..
سەبوریم بەرەوە سەبووری
سەبووری دانەوەی ژنێك
باران حاشای لەپاکێتی کردو
ئەستێرەکان بەشەوێکی ناشیا نەفرەتیان بۆ پۆست کرد ...
سەبووریم بەرەوە خودایە
من ژنێکم بەجێماو لەقافڵەکانی خۆشنوودی و
تەریك بەزەمەنەکانی پێك گەشتن ..
من ژنێکم تاریکیەکانی دڵی خۆم فێریان کردم
تەنهاییەکانم خۆشبوێ،
تەنهایم فێری کردم

بڕۆمەوە سەر ڕەنگی یەکەمین بێدەنگی
تەقاندنەوەی یەکەمین لوغمی پرسیار،
ئای خودایە سەبووری
من ژنێکم
هەڵوەرینم فێری کردم نەفرەت بکەم لەسەوزبوونەوە،
تۆ پێم بڵێ هاوڕێم
کێ ئەتوانێ ئەم هەموو تەنهاییەم حەشرکاو
قیامەتی ئەم شکانەم هەڵگیرسێنێ،
تۆ پێم بڵێ
دڵە گیان جەنەتو سەقەری من لەگیرفانی دڕاوی چ ئێوارەیەکدایە؟

شەوی حەشرو نەشری ئەم بێهودەییەی من کەی ئەکا؟
ئای خودایە سەبووری،
دوای ئەوەی دەرکەکان داخران،
دوای ئەوەی پەنجەرەکان پێچرانەوە
ئەگەر دەرگایەك بۆ کرانەوە ماوە بکرێتەوە..
خودایە سەبووری،
من ژنێکم وەك دەڵێن
(ئاوێنەی سەبرم شکاوە)
مەحاڵە بتوانم،
دڵی شکاوی ئەو هەموو خەونانەم بدەمەوەو



پەیامی ئەو هەموو ئێوارە پێکراوانەم
بگەیەنمەوە بیمارگایی مێژوو،
مەحاڵە بتوانم
بەدەم ژەندنی گیتاری خەمساردیمەوەو
بەبەیانیەکی موڕاهیق بڵێم :
من ئەتوانم لەم لیتاوی ترۆ بوونا
دەمو چاوی نیشتمانت بۆ کۆکەمەوە،
ئای خودایە
من ژنێك بووم،
بەیانی بەخشیمیەئ ێوارەو
ئێوارەش بەخشیمیە تاریکیەکان،
تاریکیەکانیش بەتەنهایی و
تەنهایش بەبیرچونەوە،

2002

1) دێڕە شیعرێکی (جەمال غەمبار)ی شاعیرە..



## (خوێنێك بۆ تەوێڵی پیاوەتی)



ئەم عەزابە بەشانی منەوەیە یاخود بەشانەکانی تۆوە؟
ئەزانم سەختە نووسینەوەی دنیا
ئەزانم گرانە وتن بەم هەموو برینەوە
ئەزانم گرانە تا بیرکردن لەم بیرەوەرییە جەهەندەمیانە.
تۆ زانیوتە من هەمیشە نهێنیەکم هەیە،
بەیانیان لەژێر عاجزترینی خۆما ئەیشارمەوەو
شەوانەش بەدزی ئەستێرەکان
لەژێر تەڕترین تاریکیا هەڵی ئەگرم،
دایکم هەمیشە ترسێکی هەبوو،
سارد لەبەختەوەری من و
دایکم هەمیشە گومانیکی هەبوو،
خوێناوی تر لەو هەموو خەنجەرەی کە لەبەیانی منایە،
ئەو کاتانەی
گلێنەی ماسیە مردووەکانی بۆ کچەکەم کۆئەکردەوەو
لەشەو تەنهایی منی چیٚ ئەکردم
بە(روئیا)ی ئەوت:
تەماشا
کچیٚ دایکت هەمیشە نهێنیەکی هەبوو
نە بەمنی ئەوت و نە بەئێوارە
نە بەمنی ئەوت و نە بەگوڵە پاتۆنیاکان
نە بەمنی ئەوت و نە بەخوشکەکانت،

نە لەشیعرا ئەینووسیەوەو
نەیووت لەبەردەمی خوا،
نەبەدەم خەوەوەو ڕاوەی پێئەکردو
نە ئەیدا لەسینەی هیچلا،
کچێ دایکت
هەمیشە نهێنیەکی هەبوو
نە بە باوکتی ئەوت‌و نە بەخوا
نە بەشیعری دەوت‌و نە بەدەریا،
نهێنیەك:
نە دەچویەوە سەر ڕەچەڵەکی نهێنیەکانی من و
نەدەش چوویەوە سەر رەچەڵەکی هێنی خوشکەکانی و
نەدەش چوویەوە سەر ڕەچەڵەکی نهێنی کچە قۆشمەچیەکانی
هاوڕێی،
ئەو کە هەمیشە دەیگووت:
بەڵام نهێنی هەموومان یەك نهێنی و
چاوەڕوانی هەموومان یەك چاوەڕوانیە...
دایکم وەك بڵێی تەنهایم ببوغزێنێ
وەك بڵێی ورك لەسەرکەشیم بگرێ،
لەساجی ئاشپەزخانەکان بەخەتێکی لار ئەینووسی:
(ناشتاییەکی چەند ساردە دنیا
بەلێوی ژنێکی ناشاد ...)



منیش بەبزەیەکی تاڵەوە
ژێر سکی دەفتەری قارچکێکی تەنیام هەڵدەدایەوەو دەمنووسی:
با دەمو چاوی ئەم گومانە نەڕووشێ
با چرایی ئەم فیتنەییە خامۆش بێ
با ئەم ژنە نەیەتەوە دنیا،
ژنێکە لەنەسلی شەیتان
کێ ئەڵێ هاتەوەدنیا
نەفرەت ناکا لەهەموو جوانیەکانی خوا،
ئەو دەنگە لەزەمینەوە ئەهات یان لەدەریا،
دەنگی ترساوی پەیامبەرەکان بوو
یان دەنگی ئەو کوڕە ڕەش تاڵانەی
کە لەهێلانەی چۆلەکەکانەوە،
بەدەم وەرینی پووشەکانی حیشمەتیانەوە
هێلکەی چۆلەکەکانیان دەگرتەوە قاچەکانم و
بەیەك ئیجا دەیانگووت :
دەریکەن بەم شەوە لەدنیا
ژنێکە لەتوخمی خەتا ......
من گەرەلاوژەیەکم لەدنیادا نایەوە
یان دنیا گەرەلاوژەیەکی لەدنیادا خوڵقاند،
دایکم لەتاریکترین دەنگەوە هاواری ئەکرد:
–کچەکەم مەیەرەوە دنیا،

هاتنەوەی تۆ ئارامی حەوشەکەمان و
ڕەونەقی گوڵەنازنازەکان ئەبات !!
–دایە مەیەرەوە دنیا،
وای لەو ڕۆژەی هاتنەوەت
خەوەکەی باوکم و تەنهایی تێك ئەدات،
هاتنەوەت پاشەکەوتکردنی پشکۆیە لەدەخیلەکانی دڵا!!
هاتنەوەت خوێندنەوەی کتێبێکە لەوەرین،
لەیەکەمین دێڕەوە کەون شەقار دەکات ...
براکانم ئەیانووت:
–هاتنەوەی تۆ خوێنێکە بەتەوێڵی پیاوەتیمانەوە،
هاتنەوەی تۆ جەنگێکی دیکە بەحەیسیەتمان ئەگێڕێ ....
خوشکەکانم ئەیانگووت:
شێتە گیان مەیەرەوە دنیام
تۆ کە ئەوەندە بچوکی لەزاری بەیانیەکدا جیت دەبێتەوە،
تۆ کە ئەوەندە بچوکی لەشەقامی ترسێکدا نادۆزرێیتەوە،
هاتنەوەت و نەهاتنەوەت
نوکتەیەك ناخاتەسەر دنیا !!
من وتم
–ئەڕۆمە دەرێ ڕووت و قووت
بەردەبارانی کەن ژنێك لەهەناسەی گولی
بەردەبارانی کەن ژنێك لەڕەچەڵەکی ئاشووب



بەردەبارانی کەن ژنێك لەنهێنیەکی گەورە،
دەریکەن با نەیەتەوەدنیا،
ژنێکە لەتوخمی خەتا،
کێ ئەڵێ هاتەوە دنیا
نەفرەت ناکا لەهەموو جوانیەکانی خوا ....؟؟!

2002



**کۆی ئەو تێکستانەی کە**

**لەتاراوگە نووسراون**

**( هەناسەی دووەم )**

# دوا ئایەتەکانی ژنە پێغەمبەرێك لەتاریکی



**خودا**

ئەی تەنیاتر لەمن

ئەی لەتۆ تەنیاتر من

تۆ لەهەموو جێیەکی و ماڵت نیە

من لەهەموو ماڵێکم و جێم نیە

ئەی بێگوناهتر لەمن و

ئەی لەتۆ بێگوناهتر من

تەماشا

چەند بەیەکتر دەچێت شەوی شەهادەتمان

چەند بەیەکتر دەچێت شەوی هەڵوەرینمان

چەند بەیەکتر دەچێت شەوی ڕوتبوونەوەمان.

**پیاو**

ئەی لەتۆ دیلتر من و

ئەی لەمن دیلتر تۆ

من دیلی جەنگەکانی تۆو

تۆ دیلی جەنگەکانی خۆت

ئەی لەمن قوربانیتر تۆو

ئەی لەتۆ قوربانیتر من

من قوربانی خەنجەرەکانی تۆو

تۆ قوربانی شەهوەتەکانی خۆت

من دەستێك دەستەمۆم دەكات
تۆ مەهزەلەی شەهامەتێك
من بچووكی دەمكوژێت‌و تۆ گەورەی
ناگەهان دوا لاپەڕەی یاداشتی فەیلەسوفێكم خوێندەوە
كە نووسرابوو
. نا تۆ دیلنیت
ئەی نازەنینترین جەلاد
تۆ خوداو پیاو و نیشتمان لەكریشمەیەكدا دیلدەكەیت
دایكم لەپیریدا وەختێك
مردن لەتەنهاییەوە فوارەی دەكرد
شتێكی وت
نازانم بۆ كەناری
بەتەوسەوە سەیرم دەكات و
تەریق تەریق دەبێتەوە
كچەكەم كە هێشتا دارەدارەی ئەم وەحشەتەو
تارمای ئەم عەبەسە دای نەچڵەكان بوو
وتی
چوونكە قەفەسەكەی تۆ لەقەفەسەكەی ئەو بچووكترە.

تێبینی:
سێ كۆپلە شیعره لەقەسیدەیەكی درێژ.



(ژنێك لەنامەیەكیدا بۆ ڕەقیب وا ئەنوسێ)

( نامەی یەكەم )

شەوێكی خۆم
لەنێوان بەهەشت‌و جەهەندەمی تۆ دا هەڵەخەم
ئەی ڕەقیب،
چركەیەكی خۆم ئەبەخشم بەمنەتی تۆ بەسەر ژنێتیمدا.
ئەی ڕەقیب هەر ماوە قەومی ئەم ڕاڕاییە،
هەر ماوەو سەرەتایەتی ئەم نیگەرانییە،
ئەی ڕەقیب
ئیدی نە بە بیرەوەری تۆ و
نە بەبیرەوەری منا
گوێزی ئەم نائومێدییە
لەدانی هیچ پیرە خوایەكدا ناشكێ ..
وتم،
بوەستە تاعومرێك لەگەڵ تەنهایی تۆ و،
تا عومرێك لەگەڵ تەنهایی خۆمدا دێمەوە.
ئەی ڕەقیب،
ئەوە كاسەی تۆو ئەوە خوێنی من.

ئەوە گەردنی منو ئەوە سێدارەی تۆ,
ئەوە ژەهری تۆو ئەوە گەرووی من،
ئەوە مەمکی منو ئەوە پەنجەی تۆ ..
ئەی ڕەقیب،
پەلەتر دامهێڵە
ئاخر حەوسەڵەی من لە ئۆی هەموو مردنەکانی تۆ دێت،
پەلەتر دابەشم کە لە نێوان
خۆم و، خۆت و، جەهەندەمدا،
چەندە عاجزم شەوێك خەبەرم ئەبێتەوە و
قامچیەکەی تۆ خەوتووە؟
سپێدەیەك نازنازێکی چاو ئاوساو لەژێر لێوەوە پێم ئەڵێ
(بەیانیت باش)
ئەی ڕەقیب بازیبەندەکەم فڕێ ئەدەمە دەریاوە و
وەك کزۆڵەترین نێچیر چەکم کە..
ئەی ڕەقیب وەك پیرترین سۆزانی لەبەردەم باکاندا
ڕووت ئەبمەوەو تەعەدام لێ کە.
مەیەڵە ڕووناکی لەتاریکیمدا پێبگرێ،
ڕێگە مەدە پرچم ئەستێرەی لێ بچۆڕێو،
نەعنا لەپەنجەکانما بڕوێ،
خەنجەرەکەت لەئاو ڕاست کەرەوەو
مەیەڵە بمگرێتە خۆی،



هەڕەشە لەباخچەیەکی تاکتیك باز بکە
کە بەنیازە شەوێك داڵدەم بات ..
تەقە لەنەوڕەس بکە و
مەیەڵەلە حەسوودیم بفڕێ ..
لەجیاتی گوڵ نێو لەپم پڕکە لە باڕووت،
لەبری دەم کردنەوە بۆ باران
رامبێنە دەم بۆ برینێکت بکەمەوە،
ئەی ڕەقیب ...ئەی ڕەقیب،
وەك خەواڵوە ئاواییەك لەشکرەکەت
بەسەرما بەو داگیرم کە،
بێستانەکانم بەرە بۆ خۆت،
کانیلەکانم بەرە بۆ خۆت،
دۆژەنگەکانم بەرەبۆ خۆت،
ئەرخوودەکانم بشکێنەو مەلۆتکەکانم ئەنفال کە.
زرێ فەرەنگیەکەت لەبەرکەو کلاوخوودەکت لەسەرت دانێ
ئەی ڕەقیب نەعرەتەی جەنگی لەو پیاوە ئەسمەرە لێبە
کە بەدزییەوە لەنامەیەکا بۆی نوسیووم
(خۆشم ئەوێ) .
ئەی ڕەقیب،
بڕوا بکە ناتوانم لەبیری خۆمی بەرمەوە ئەم نیگەرانییە،
لەفەسڵێکدا شەو وەك پیرترین چەتەتێم ئەخوڕێ و

تۆ دیار نیت،
لەبەیانیەكدا ژیان لەسەر پەنجەكانم
ئاگر ئەكاتەوەو تۆ ونیت،
پێم بڵێ ئەی ڕەقیب پێم بڵێ كە دێمەوە،
تا جورئەتی مردنێكی قووڵتر لەخۆمدا نەكوژم،
تا لەبیری نەبەمەوە ئێوارەیەكی تر چاوەڕێت بم .
ئەی ڕەقیب،
تۆ تەنها ئەغیاری من،
من تەنیا ڕەقیبی تۆ ......

**( نامەی دووەم )**

(ژنێكی بوغرا بەڕۆحی پەتی ئاو)
( لەنامەیەكی تردا بۆ ڕەقیب وا ئەنوسێ)
تاجەكەو دانێ ئەی ڕەقیب،
بزانە كاممانین لەتەنهایدا سوڵتان،
من ژنێكم لەڕۆحی پەتی ئاو
ئەستێرەیەكم لەچاوی دوورترین درەوشانەوەدا .
ئەی ڕەقیب، ژنێك
ململانێی لەئاودا هەیەنەك لەزەمەن،



ژنێك ململانێی لەتاپۆكردنی دڵی خوادا هەیە
نەك دڵی تۆ،
من ژنێكم بێ مەقسەد لەڕەنگی با،
بێ مەقسەد لەتوڕەیی ئاو،
دەهشەتم لەگوڵا پەل ئەكووتێ و
ڕوانینم لەگروگاڵی باخچەدا پیاسەئەكا و،
درەنگتر لە دانیشتنم بەدیار كرانەوەی
نازنازێكەوە ئەگەڕێمەوە.
بەدزی تۆوە ژیان ئەهێنمە نێو ژانتاكەمەوە،
ئەوەلیتی مانگ لەقولایمدا هەڵدێ،
ئاو بە بەرائەتم لەش پیسی دەر ئەكات.
بێ مەقسەد لەمردنێك لەخەنجەرەكەی تۆوە بتكێ،
ئاخر من غوسلێ دراوم
بەخوێن و تابووت و مردن،
ئەی ڕەقیب
من ژنێكم جێگە پێم بەسەر ڕۆحی
ئەم تاریكیەوە بەجێ ماوە نەك جادە،
مفەڕكم دواهەمین دەسنووسی مینایەكە
لەپەنجەی ڕەشەبایەكی شەهوانی دا،
ئەو وەختەی ناپەرژێ بەباخچە بڵێ
خوا حافیز،

بەدزییەوە بۆم ئەنووسێت،
ژنەکە ئەزانیت سبەی فەسڵ کە گەڕامەوە
وەك خۆم نابم ..
من بوغرام کەناری تا پیربوونی خۆی
لەوتنەوەی ئیحایەکما خۆی ئەکوژێت،
پەپوولە بەچپەوە پێم ئەڵێ:
کوێربم ئەگەر جیاوازی بکەم لەنێوان
تۆو شەستپەڕێکا،
من بووغرام بەگومانێك حەقیقەتمی تیا ماندووە؟
من بوغرام بەفڕینێك لەحەسوودی نەوڕەس دا
پاڵ کەوتووە،
من بوغرام مردن تەپ بەسەر تەنهایم دا
ئەکەوێ و داناچڵەکێ،
من بوغرام ئەی ڕەقیب من بوغرا،
مەلەی من لەفەزادایە نەك دەریا،
دەریای من قولایی خۆمە
نەك ڕۆحی ئاو ......
(پۆستکەی ڕەقیب دوو نامەی تێدایە
ڕەقیب لەوەلامی هەردوو نامەکەدا وا ئەنوسێ)
ئەی ئەوەی لێوەکانت تاقانەترین ئارشیفی
ماچە گەرمەکانی منە کە ڕەقیبتم .



بۆنی من تاقانەترین نووری تونێلە تاریکەکانی
بیرەوەریتە کە ئەغیارمیت،
تۆ ژنەکە
ئەی ئەوەی باوەشت پڕە لەمن و،
پڕە لە هیتلەر و،
پڕە لەئاراگۆن و،
پڕە لە ئەتاتورك و،
پڕە لە مەولانا و،
پڕە لە ڤان کوخ،
تۆ ئەی ئەوەی
لەژووری سیاسیەکاندا ڕووت ئەبیتەوە،
لەژووری شاعیرەکاندا ڕووت ئەبیتەوە،
لەژووری ئیمپراتۆرەکاندا ڕووت ئەبیتەوە،
لەتیاترۆخانەکاندا ڕووت ئەبیتەوە،
لەژووری جەلادەکاندا ڕووت ئەبیتەوە،
تۆ بوغرای بەدرێژترین پیاسەی من
لەسەوزایەکانی سەر سنگتدا و،
بەقووڵترین مەلەی خۆت لە
شەوە جەهەنەمیەکانی مندا،
تۆ بوغرای بەکردنەوەی نهێنیترین دەرگا
لە ڕاوی خۆت ؟

تۆ بوغرای بەیانی بەر لەوەی خەبەری بێتەوە دەگەمە لات،
وەك مەلۆتکێك چۆن دەم ئەنێ بەنووری مەمکێکەوە
دەم لەگۆی ئەم خوێنە بەرنادەم ودەگەمە لات..
بەر لەوەی شەو لەسێبەرتا ڕاکشێ
تەنهایی لەئێوارەتدا خۆی بتەکێنێ
دەگە مەلات ..
من دەگەمو ماتڵم بەشەرمەزارتم ژنەکە شەرمەزار،
شەرمەزارم لەهەزار ئاوێنەوە دێمەوە و
لەهەزار بەرگەوە ئەڕۆم و
لەهەزار تەلیسما خۆم ئەشارمەوە
ئەمناسیتەوە؟
وای ژنەکە شەرمەزارتم،
شانت داوەتە بەر عەرشی خوایەتیم نایەڵیت
شکۆم بلەرزێت،
لە ڕۆحی قووڵترین بێدەنگیتدا تاجی شاهانەمت
وەك چەپکەنێرگزێك گرتووەو نایەڵیت بکەوێت ...
شەرمەزارتم ژنەکەلەشکری شەهوەتت نایەڵێت
ئالآی پیاوەتیم بنەوێت
قەرزاری بێباکیتە عەزەمتم .
وای ژنەکە میوەی نەگەییوو حیکمەتی کاڵت
نایەڵێت پیربوونم بنووسمەوە..



ژنەکە بێدادەیی خۆت نایەڵێت مردن
وەك قامچیەکەی نێو دەستم دالدەم بات ..
شەرمەزارتم ژنەکە
لە درەنگ هاتنم شەرمەزار،
ئەو وەختەی گوڵەباخ بەمەمکی خۆی
سەنگەرم لێ ئەگرێو پێم ئەڵێت:
ئەی ڕەقیب
گەر نەمکوژیت ڕەونەقی شکۆفەم لە
ڕەونەقی دڕکەزێیەك زیاتر نابێت،
بمکوژە ئەی ڕەقیب،
من ئەمرم ئەو وەختەی عاشقێ لەنێو قەدی دەفتەرەکەیدا هەڵم
ئەگرێ،
من ئەمرم ئەو وەختەی قوتابیەکی سەلار
لەبەیانیکا کە ژیان بەدەم خۆیەوە پێ ئەکەنێ
بە دیاری بۆ مامۆستاکەیم ئەبات،
من ئەمرم لەژێر زرمەی پۆستاڵێکدا من ئەمرم،
من ئەمرم لەنامەی عاشقێکا من ئەمرم ،
من ئەمرم لە کەپووی ژنە فاڵچییەکا من ئەمرم،
من ئەمرم لەپەنجەی مناڵێکا من ئەمرم،
من ئەمرم لەژوور سەری دەردەدارێکا کە ئەوەندەی
دەنکە گەردیلەیەك ژیان بەدڵیەوە نەماوە من ئەمرم .

من ئەمرم لەبەرچنەی دارینی ژنە گوڵ فرۆشێکا
کە بە ڕەنگی من شەڕ لەگەڵ جوانی بەیاندا ئەکات
من ئەمرم .
ئەی ڕەقیب بمکوژەو مەیەڵە لەوە زیاتر پەپوولە
بەناوی عەشقەوە تەعەدام لێکات،
شەرمەزارتم ژنەکە
ئەو وەختەی گوڵەباخ بەمەمکی خۆی
سەنگەرم لێ ئەگرێی پێم ئەڵێ:
چەند بە یەکتر ئەچێت ئەی ڕەقیب
دواشەوی من و ئەو ژنە،
تەماشا بەچەپك واین لەژووری سیاسیەکاندا،
بەچەپك واین لەباخەڵی شاهەنشاکاندا،
بەچەپك واین لەسەر تەختی سوڵتانەکاندا،
بەچەپك واین لەسەرمێزی موعتادەکاندا و،
بەچەپك واین لەنێو مەحفەزەی ڕۆشنبیرەکاندا و،
بەچەپك واین لەنۆتەی مۆسیقارەکاندا و،
بەچەپك واین لەفڵچەی شێوەکارەکاندا..
شەرمەزارتم ژنەکە
بەهێندەی بێدەنگترین منەتت
بەسەر شکاوترین شەرەفمدا .
شەرمەزارتم ژنەکە ئەو دەمەی کەناری بەغەمگینترین



ئیحا بانگم ئەکات:
ئەی ڕەقیب،
من ڕقم لەم ئازادییە بۆگەنەیە؟
بمکوژەو با ژیان لەنەخشی خوێنی من
ئەو خوێنە لەیاد نەکات کە لەسەر تەوێڵی وەك دووڕی
قەراڵەکان ئەدرەوشێتەوە ،
من ماندووم ئەی ڕەقیب بەپیرترین خەیاڵی
ئەم وەحشەتەو،
بەدرێژترین داڵغەی ئەم بێداڵدەییە،
ئەی ڕەقیب من ماندووم مەیەڵە ئەم ئازادییە لەئازارما پێبگرێت
مەیەلە ئەم ڕووناکیە لەگروگاڵما بپشکوێت
ئەی ڕەقیب حەسرەتی من مردنەلەچاوەڕوانی
دوا ئێوارەیەکی تۆدا
وەختێك بەخەنجەرەوە لە ماڵی ئەو ژنەوە دێیتەوە،
وەختێك بەخەنجەرەوە لەماڵی ئەو گوڵەوەدێیتەوە،
وەختێك بەخەنجەرەوە لەتەنهایی خۆتەوە دێیتەوە،
شەرمەزارتم ژنەکەلە ماتڵ بوونت شەرمەزار
قەرزاری بێدەنگیتە عەزەمەتم و
تا کۆتا قەرزاری بێ خۆیتەگەورەیم .....

(بەشێکی ترە لەدوا ئایەتەکانی ژنە پێغەمبەرێك لەتاریکی)



## منو مردنو خودا بەسەر پشتی ترسێکی ترەوە

بۆ کچەکەم (ڕوئیا)، بۆ ئەو کەسەی لەنێو جەهەندەمەکانی مندا پیری خۆی ئەبینێت



من هەر دەبوو مردنو ژیان لەخۆمدا ئاشت کەمەوە،
هەر دەبوو گوێ لەدوا تیری دەنگێك بگرم
کە وەك تەنهایی خۆم ئەیپێکام،
من هەر دەبوو ئاوڕ لە شتێك بدەمەوە
کە هاواری ئەکرد:
قسەیەکی تر بکە،
ئەی ئەوەی تەمەنت بەشی ئەوەناکات
سەری ئەم پرسیارەی لەبەرا سپی کەیت!
من مردنم،
من جەنگم لەگەڵ بەیانیدا هەیە
من ئێوارێ بەنێو تاریکیدا هەڵەکەمو بەیانی پێم ئەڵێ:
بەڵام تۆ سبەینێت تاپول کردووە!
من مردنم،
بەڵام دوانوکتەم نیە بۆ کەسێك کە بۆ خۆی دوا نوکتەی نیە،
کۆتایم نیە بۆ کەسێك کە لەوسەری بێ کۆتاییەوە قسەیەکی لەگەڵ
کۆتایدا نیە!
کۆتایی من درەنگ دێ،
کۆتایی من ئەوەندەی کۆتایی خۆمە بۆ کۆتاییەکی تر،
کۆتایی من کۆتایی بەیانیە،
هەتا بەیانی بەدەم خۆییەوە پێبکەنێت
من بەدەم تەنهایی خۆمەوە ئەگریم،

ئای کە ڕقم لە بەیانیەوە کە دۆستی بەیانیم،
من مردنم،
من ترسم لەبەیانی دا هەیە،
کەس ئەوەندەی من لەپەنجەی ئەو کەمانچەژەنە تەنیایە
نەترساوە کە فرسەت لەجەربەزەیم وەردەگریٚ و
بەعومرێك لەپەنجەی بادا
نۆتەی بەیانی لێ ئەدات،
چاو لەو کچە ئەسمەرەدا هەڵەخەم،
ئەوکاتانەی بەڕەنگی خۆی تەنهایی خۆی ئاو ئەداتو ئەڵیٚ
: بەڵام من هێشتاکە دۆستی تۆ نیم،
هەرچەندە ئەشزانم بەیانی دۆستی تۆیە
نەك دۆستی من!
_بەڵام من دۆستی کەسێکم کە دۆستی من نیە
قەهر ئەگرم بەیانی بەدەم خوێندنەوەی
کۆتانامەی ژیانەوە ڕەنگەکانی خۆی دابەش ئەکات،
ڕەنگێك بۆ باخچە،
ڕەنگێك بۆ دەریا،
ڕەنگێك بۆ بەختی ئەو پیاوە تاریکەی کە بەدەم دوا پرسیاری
منەوە یاری بە ڕۆژەکانی خۆی ئەکات،
جەنگی من لەگەڵ بەیانی دا هەیە
لەبەیانیەکدا کە من یاری بەیانی نیم



ئەوەی نایەڵێت منو بەیانی یاربین
تۆیت ئەی ئینسان،
تۆیت ئەی کەسێك تەمەنت بەشی ئەوە ناکات
سەری ئەم پرسیارەی لەبەرا سپی کەیت!
من مردنم
یەکەمین دۆستی بەیانی
ئەو دۆستەی کە لەیەکەم شەوی پەردەوە
ژیان لێی هەڵگێڕامەوە!
تۆ لێت هەڵگێڕامەوە ئەی ئینسان!
خودا لێی هەڵگێڕامەوە
ئەوکاتانەی بەدزییەوە دەستی دەهێنا بە سەرما و
بەچپە پێی دەوتم:
ئەوەندە نابات دەبێتەوە بەدۆستی تۆ
بەیانی میراتی تۆیە نەك ژیان !
بەیانی میراتی تۆیە نەك ئینسان!
ئەوەی میراتی تۆ نیە منم!
ئەوەی دۆستی من نیە تەنها تۆی!!
جەنگی تۆ لەگەڵ من دا هەیە نەوەك بەیان
من دەمووت:
بەڵام من تموحم لەدواهەمین شەوەی تۆدا هەیە،
لەبەیانیەکدا گەنجێتیم بەیانی ڕاو ئەکات

ترسی من وەك پشیلە نۆڕۆ ئەکات
هاوار ئەکەیت:
من چی بووم،
جگە لە کارکردەیەکی پیر،
بێ لەکەسێك ماندوویەتی لە خواکان ئەدزیی و
لە مەرگی خۆی هەڵی هەگرت!
من چی بووم،
بێ لە باخەوانی ئەو باخچانەی کە بە مەرگی خۆم بەیانیم پێ
هەڵەکرد،
من چی بووم،
تۆ تموحت لەکام شەوی مندا هەبوو،
کە من تەنها شەوێکم نەبوو بۆ خۆم،
کە نە بەیانی میراتی من و،
نە خودا میراتی من و،
نە باخچە میراتی من و،
نە خۆم بووم بەمیراتی خۆم،
من چی بووم؟
بێ لەکەسێك شەوکووتی لەشکۆی خوادا ئەکرد و
تۆ ترست لەگەڵ دابەش کرد!
من چی بووم گاوانێك بووم تەنهایم ئەلەوەڕان و
دەنگی خۆم لەسەر دەنگی بەیانی دائەبەست،



ئەو وەختەی ناتوانم بەژیان بڵێم:
ئەزانیت لەمنیشدا
بەیانی هەیە، باخچە هەیە، هەوا هەیە، تەنهایی هەیە،
شەو هەیە بەڵام بێ تاریکیی!
بەیانیم هەیە بێ هەتاو!
ڕاهیبەم هەیە بێ خودا،
ترسم هەیە بێ ترس
بەڵام:
ترسی منو تۆ جیایە،
تۆ تەنها لە پەنجەی من ئەترسیت و
من تەنها لەپەنجەی خۆم،
تۆ لە تەنهای خۆت ڕائەکەیت و
من تەنهای خۆم ئاوەدان ئەکەمەوە،
خوداش لەتەنهایی هەردووکمان سەر دائەخات!
تەنهایی تۆ کە ئەوەندەی هەناسەی چۆلەکەیە کە لەتەنهایی من!
تەنهایی خودا کە ئەوەندەی چەکەرەخەوی
کەروێشکێکە لەتەنهایی من!
بەڵام من تموحم لە دوابەیانی تۆدا هەیە
لەکاتێکدا ڕەنگی تۆ لەژێر دەستمدا
وەك ترسی من لە دواهەمین شەوی خوادا فیچقەئەکات!
تۆ بەسەر شانی عومرتەوە شل کەوتوویت و

سۆزانیەکی بێ حیشمەت بووم و
کۆشی خۆم لەبەردەم تۆ دا،
لەبەردەم ئێوارەدا،
لەبەرامبەر خودا هەڵدەداییەوە
هاوارم ئەکرد:
مەیەڵە مردن دواهەمین زۆڵم بناسێت!
پاڵەوانێکی بەسەر شکستدا کەوتبووم
بازیبەندوو گورزەکەم دائەناو
پێم ئەوتی:
داگیرم کە!!!!!
من چی بووم ؟
بێ لەو دۆستەی کورێنیم لەگەڵ ئەکردی و
بۆم ئەنووسیت :
لەهەر گوڵێکدا بۆ تۆ باخچەیەك،
لەهەر بەیانیەکدا بۆ تۆ وەرزێك،
ئەی ئەوەی بەدیار دواهەمین
شەوی خواوە دانیشتووی
شەوی من بۆ تۆیە،
من چی بووم،
کچە هەرزەیەکی قاشقونجی بووم
هەر بەچاو داگرتنێکت



تەلبەندم بۆت ئەترازاند و
گۆزەم ئەشکاند،
من چی بووم،
تۆ خوێنی کامە شەوی من گرتبوویتی
لەشەوێکدا هاواری تۆ یاری بەشکۆی خوا ئەکرد،
کەبەیانی دواهەمین میراتی من بێت،
کەئینسان دواهەمین میراتی من بێت،
کە ژیان دواهەمین میراتی من بێت،
من گومانم هەیەکە تۆش دواهەمی
میراتی من نەبیت!!،
لەبەیانیەکا کە بەیانی کۆیلەی منە
کۆیلەم نەبیت!!.

2005/3/14



## (باخەوان لەپێچەوانەی خۆیدا)



بۆ خودا یەکەمین باخەوان

بۆ باوکم کە باخەوانی دایکمە

بۆ خۆم کە باخەوانی کچەکەمم

پاڵم داوە بەم تاریکیەوە

باخەوان پێم ئەڵێت:

بەڵام تۆ ڕووناکیت لەپێشە

بەڵام من تای نووریکم لێ هاتووە کە دەڵێن بەیانی دێ و

کوتوپڕ شەوت تیا ئەتەکێنێت!

دڵم داوە بەم تاریکیەوە

دەستم وەك دەستی باخەوان بە شەرەفی باخچەوە ئەلەرزێت

تای تاریکیەکم لێ هاتووە کە دەڵێن ئێوارەدێ و

بەیانیو لێ ئەفرێنێت!

بەگومانەوە وەستاوم

لەنێوان جەنگی دوو ئاوێنەدا

کەئەم سەرەوسەری شتێکیان لێوە دیارە

باخەوان پێم ئەڵێت:

ئاوێنەی تۆ لەتاریکی مندا ئەدرەوشێتەوە ئەو وەختەی

ژیان وەك بێحیشمەتترین سۆزانی لەبیری ئەچێتەوە لە کوێدا

جێی هێشتووی

دنیا وەك سێوێکی گەنیوو نە لە باخەکانی منا و

نە لە باخەکانی سینەی تۆ وا لەرەی نایە!

باخەوان ئەڵێت:

ژیان بەرگەی پیرێتی ئەم نووره ناگرێت !

من ئەڵێم :

بەڵام من ئەم تاریکیە ماندووم ئەکات!

باخەون ئەڵێت

حەقیقەت بوز لێدانە بەتاریکییەوە

کێشانی هەلهەلەیە لەخوێنی خۆت.

من ئەڵێم:

بەڵام نۆبەرەی مەرگی من وایکرد بولبول تا دواهەمین سەحەر

تەنهایی بچرێت،

ئاو تا دواهەمین ئاوڕدانەوە پیر نەبێت،

حەوسەڵەی بەباخچە بەخشی تا پیربوونی دواهەمین گوڵ

شکۆفە بژمێرێت.

باخەوان ئەڵێت:

بەڵام شەوی تۆ نەیهێشت بزانم ئەوەی لەگیرفانی تاریکیدایە

مەرگی منەیان مەرگی تۆ،

مەرگی من کە لە هەموو دەرگاکانەوە هات

کە لە هەموو پەنجەرەکانەوە پێدزەی کردە تەنهایمەوە

لەو ئاوێنانەوە ملی کێشا کە وەك بەختی تۆ

لەگیرفانەکانمدا نووستبوون،

من دەمگووت :



بەڵام ژیان بەیانی لەبەردەم حەوشەکەماندا

بەجووتێ کەوشی زللەوە چاوەڕێمە،

چاوەڕێمەو شەرمی ئێوارەیەکی ترم تیا ئەشکێنێت

تۆ دەتگووت:

بەڵام من شەرم لەهەموو بردنەوەیەك و،

گومانم لەهەموو گەمەیەك و،

تورەیم لەهەموو هەستانەوەیەکە!!

پاڵم داوە بەم تاریکیەوە

خەریکم لەدابەشکردنی شتێك ئەبمەوە،

باخەوان پێم ئەڵێت:

بڕوانە ژنەکە چۆن ژیان لەچاوەکانتا وەك زەلیل ترین

قوربانی کسکەی کردووە،

من بەرەنجی خۆم بەیانی دروست ئەکەم

ئەوەی بەرەنجی خۆی بەیانی دروست بکات

باخچەی تاریکی ناگرێت.

تۆ خاوەن باخ تۆ بەرەنگی خۆت تاریکی دروست ئەکەیت

ئەوەی بەرەنگی خۆی تاریکی دروستبکات

بەیانی بەدەمیەوە پێ ناکەنێت!

بەڵا م من هاتووم شتێك کۆبکەمەوە

ئەی ئەوەی بەرەنجی خۆت بەیانیت کڕیوە

من بووغزم لەبەیانیە کە بەدەم رەنجی تۆوە پێئەکەنێت

ڕقم لەخەنجەری تۆیە ئەو وەختەی پاسەوانی باخچە ئەکات
ئەو کاتەی بەباران ئەڵێت:
ئەزانی هیچ وەرزێك ژیان لەچاوەڕوانی هاتنی تۆدا ئەوەندە وشك
نەبۆتەوە،
باخەوان دەستێکی شەرەفی منی گرتوەو
دەستێکی شەرەفی باخچە،
باخەوان جێنشینی خوایەکە کە قسەیەکی نیە
لەگەڵ سەربووردەی گوڵ و
قسەیەکی نیە لەگەڵ من
کە وەك کەسێکی وڕك گرتوو بەمەرگی خۆمەوە
بەدزییەوە پێی ئەڵێم :
ژیان لەژێر قەمسەڵەکەی باخەواندا
وەك دەنگی تۆ لەتەنهایدا ئەلەرزێت
وەك ڕەنگی من کە تۆ بەیانیانێك لەگەڵ باخەواندا
ماتڵی دابەشکردنی دواهەمین خشتەی شتێکیت هەڵەوەرێت!
باخەوان لەحیکمەتی تۆدا
بیر لە ئەفسانەکانی خۆکوشتنی من ئەکاتەوە لەئاوێنەکاندا
من لەئاوێنەکاندا بیر لەمردنی تۆ ئەکەمەوە لەبەختی باخەواندا!
ئەو کاتانەی مەرگ مەرگ ئەم تاریکیە هەڵدەگرمەوە
چونکە تەنها لە تاریکیدا ئەتوانم
پەنجەکانی تۆو پەنجەکانی باخەوان،



بەسەر شەرەفی خوایەتیمەوە جیابکەمەوە!!!!
باخەوان پەرژین ئەترازێنێت
ئەڵێ:
نەما لەنێوان منو تۆو خودادا قسەیە
ئەڵێ برۆ بەڵام بیرت نەچێت هەموو ڕێگایەك پێویستی بە
ئاوڕدانەوەیە!
ئاوڕدانەوە لەمن نا
لەبەربەریەتی ئەو باخچانەی کە لەبێ منیا بانگیان ئەکرد:
ئەی دواهەمین میراتی خوا ڕەنگی ئێمەبە پەرژینی تۆوەجوانە؟
ژیان بە شەرەفی تۆوە ئەتوانێ سوێند بەسەری مردن بخوات،
مردن بەهەیمەتی تۆوە کە ئەتوانێ بەو هەمووە ڕەنگەدا هەڵکات و
دواهەمین سڵاوی ئێوارەش فەرامۆش کات!
پاڵم داوە بەم تاریکیەوە
تەماشام لەتەنهایی پیاوێکدا پیر ئەبێت
کە ژیان وا بەسەر قەلاندۆشکانیەوە نرکەنرك دەیباتە بیمارستان،
باخەوان ئەڵێت:
تۆ ئەی ئەوەی فڕینت لەتاریکیدا دەست پێدەکات
من دەبوو دەستەکانم بکەمەوە ئاسمانی ئەو کۆترانەی کە
ئاسمانێکیان نەبوو تیا بفڕن!
ئەی تۆ کە نە ئاسمانت هەیەو نە باڵ
من دەبوو عومری خۆم لەجێنشینی ئەو سوڵتانە پاشەڵ پییسانەدا

تاپوول کەم کە نە تاجیان هەبوو نە ویقار
تاجی من تاریکیم بوو کۆشکم تەنهاییەکی بیٚ کەماڵ
ئەوکاتانەی بەناو خۆمدا ڕام ئەکردو ئەمگووت
ئەی ئەوەی ئومێدت بەم تاریکیەهەیە
تۆ کەسێك لەحەقیقەتی بەیانی ئەترسیت
بەیانی لەژێر ڕەنجی هەمیشەیی من
عومرێك واق وڕمانی تۆدا ئەمرێت

2004/12/25



## (بچوکترین زیندووی من )



بۆ ئەلیزا دووهەمین بچووکترین زیندووی من
بەر لە من ئۆریاناڤالاچی لەکتێبی پەیامێك بۆ ئەو کۆرپەیەی کە
هەر لەدایك نەبوو دا نووسی شتێك نییە لە نەبوون خراپتر، منیش
لەدوا دێڕی کتێبەکەی خۆمدا نووسیم شتێك نییە لەبوون خراپتر،
تۆ ئەی ئەوەی ئەم دەقە ئەخوێنیتەوە پێت وا نەبێت ئەتوانی
ڕەهایی کۆتا لە هیچ یەك لەم دوو ڕستەیەدا هەڵبگریتەوە، ئەکرێت
ئەمە دوو نەفەسی جیای نێو دوو دێڕی تاریك بێت لەبەردەم دوو
سەفەری تاریکدا، قسەیەکی ترە لەبوون کە ڕەنگە هەردووکیان
بێتو هیچیشیان نا؟!
نازانم لەتاریکییم گرتووەیان لەنوور،
شەیتان ئەخەمەوە یان فریشتە
مەسیحم پێیە یان دەجال
تۆ ئەی بچووکترین زیندووی من
ئەی ئەوەی بەم هەمووە نازیندوویییەوە لەم منە تاریکەیا زیندووی،
تۆ زیندویوی‌و حەزدەکەم زیندوویی تۆ
نازیندوویی من مەحکوم کات!!
ژیان خەریکە جارێکی تر وەك بێ ئابڕووییم بەم شیعرەوە کە
هەمیشە لەنووسینی ئەترسام
لەڕەحمی منەوە ڕێدەکات!!
ئۆریانا ئەڵێ:
(شتێك نییە لە نەبوون خراپتر)
بەڵام کۆتای قسەی من لەو بوونەوەیە کە تۆ دێیت
ئەوکاتەی ئەکەویتە ئەمبەرەو بەری سێبەرەکانی من

سێبەرەکانی خواوو سێبەرەکانی باوکتەوە ئەزانیت
بوون لەکوێی ئەم یارییەدا تا پول بووە!
کە هاتیت لەمنەوە فرزەندم :
نە کتێب، نە کورسی، نەقامچی!
لەمنەوە نە لەباوەشی سۆزانی و نە لەباوەشی فریشتە
ئاخر ژیان لەجەهەندەمی بەهەشتی ئەم دوو باوەشە دابەش بووە
ئەمە سێبەری تاریکترین دێڕی منە لەتاریکترین پرسیارما:
(کوێوە چویت ئەی منی ڕاستەقینە
ئەی ژنێك خوا لەونبوونی تۆوەونبوونی خۆی ئەبینێت)
تۆش کەدێیت لەپرسیارێکی تاریکتر ئەوبەرتر نیت،
ئەی ئەوەی کە لەسێبەری منەوە داکەوتوویت و سێبەری من نیت
من کە سێبەری تۆم و سێبەری خۆم نیم
تۆ لەکوێیت ؟!!!
کە هاتیت مەنووسە،
ئەو کاتەی کە ئەزانیت نووسین دەرکردنی گلاوی خۆتە
لەمن و لەبەیانی و لەدنیا
لەو ڕۆژانەی حەشری مردنی خۆتی تیا ئەکەیت تۆ گلاوبە..
دوای ئەم تاریکیەش مەکەوە
کە تا کوێی ئەم هەمووە سێبەرەی من گومڕایی کردووی!
(ئاخر تاریکی دەقێکە نە تۆ ئەتوانی بینووسیت و نە منیش کە
ئەتوانم بیخوێنمەوە)



تۆ ناتوانی تاریکی بنووسیتەوەو بیر لەڕاوکردنی خوا بکەیتەوە!
ئەزانیت من دوای تارمایی ئەکەوتم و هاوارم ئەکرد:
ئایندە بۆ لەمنەوەدیار نیە؟!
چاوم لەو خەنجەر دائەگرت
کە ئارەزووی بوو تەنها شەوێك لەسەر گەردنم ڕاکشێ و ئەمووت :
قەفەسم شکاند!
تۆوی مردنم لەدەستبازی ئەو پەنجانەدا ئەتکا کە
لەچاوەڕوانیاندا لەبیرم چووبووە کە ونم ..
مەلەی تەنکاوەکانم ئەکرد و بەخۆم دەگووت:
حیکمەتی ئەم قولاییە
قسەی من و قسەی دەریای جارێ تر تازەکردەوە،
لەخوێن ئاوس ئەبووم ئەمووت
فرزەندا
کە هاتیت ئەو شەوە لەیاد مەکە
کە لە چ نوورێکەوە داکەوتوویت
بزانە لەنوتفەی چ مەستە خودایەك و لەتۆوی چ عەرشێکەوە
هاتوویت
(لەژووری تەیموورو ئەتاتورك و هیتلەرا ڕۆژم ئەکردەوەو بەخۆم
ئەووت
ئەمشەوەچ سرێکە خودا لەعومرم پەڕیووە)
من ... هەمیشە برسیەك بەدیوارو بەپەنجەرەو دەرگاکان بانگم

خوا دەبێتەوەباخەوان

باوکت دەبێتەوەباخەوان

ئاخر باخچەباخەوانی ئەوێت کچەکەم،

دایکم لەدواهەمین شەوی بەرەژانی منا ئەیووت:

من رِقم لەباخچەیەکەباخەوانی هەبێت ..

دایکم بەر لەوەی دەنگی خوایەتی دایچڵەکێنێت

سك پڕ ئەبوو بەتاریکترین ترسەوەو ئەیووت مەیە،

نامەویٚ ژیان بەم هەموو شەیتانەبوودەڵەوەلەڕەحمی منەوەڕێکات!

دایکم لەبا حەملی ئەگرت و ئەیووت :

هاوار دنیایەکی قەرەباڵغ

نازانم( مەسیح)ەیان دەجال

لەمنا خەریکی گڕو گاڵە!

نەمن بووم کە هاوارمە ئەکرد نایەم، وەك چۆن کە تۆ نیت هاوار

ئەکەیت با بێم!!

تۆ لەنێو ئەم هەمووە خواوەندە

چی ئەکەیت؟؟

ئەمە قسەی دوا شەوی بەر لەخوایەتیە من ئەیکەم،

قسەی شەوێکە کە هێشتا نەبوومەتە باخەوان و باخچەی تۆ

ناناسم.

قسەی شەوێکی بێزومە،

بەحەشرو نەشری ئاوێنەیەکە، کە کەللەسەری هیتلەری تیا



ئەکرد

کوا ئاسمان بەشی ئەو هەمووە باڵەی من ئەکات !

من شەوی خۆم بەم هەموو ڕەنگەوە هەڵگرت و

بەیانیم بەم هەموو ترسە وەڕاگرت ...

نا تۆ بیر لەدروستکردنی ڕۆژگارێك مەکەرەوە

کەڕەنگی منی تیا ونە!

لەنێوان پەنجەرەو ڕوانینا هەرگیز کەمەودایەك نیە

ئەوەی دەیبینیت هەر کەتە سێبەری منەو هیچی تر !!

سێبەرێك زنجیر هەڵ ئەهێنێتەوەو بووز بەخوایەتی خۆییەوە

لێدەدات !!

نا فرزەندم ..نا،

باوەشێکی تر بدۆزەرەوە،

نەلەباوەشی قوربانی و، نەلەباوەشی جەللاد

من لەنێو ئەم دوو باوەشەدا خۆم ون کرد

لەباوەشی جەللادێکدا کەنەقوربانی بووم و نەجەللاد،

لەباوەشی قوربانییەکا کەمن قوربانی بووم و ئەو جەللاد!!!!!!!!

ئەمەئەو وێنانەکەلەشکستی من ڕەنگ بوون.

تۆ ئێستا لەمنێکی درۆینەدای،

تۆ کەمن لەبەیانیت ئەترسم

ئەو کاتەی کەدێیت و دەبیتەخاوەن باخ

ئەو ڕۆژەی من دەبمەوەباخەوان

ئەکەوێتەخوار،
بەدوا شەوی پیاوێکەکە بەگەورەیی خۆی ئەڵێت:
بۆ مێژووی منو تۆ بەم هەمووە تاریکییەوە،
بەم هەمووە ڕۆژە بێ جومگەوە،
بەم هەمووە قسە ساردەوە دووبارە بوویەوە؟!!!
بۆ ڕێگای من تۆ یەك ڕێگاو بۆ ڕێگای من ئەو هەزار ..
بۆ شەوی من تۆ ئەوەندە لەیەکتر نزیك،
بۆ بەیانی منو ئەو ئەوەندە لەیەکتر دوور،
تۆ هەموو ڕێگاکانت لەمن بەستەوە!!
تۆ ئەوەندە بچووکت کردمەوە،
کە لەگەورەیی ئەودا قسەیەك بۆ هەڵ نەگیرایەوە،
ئەی بچووکترین گەورەیم،
تۆ بێ خۆمت کردم !!!!!!
تۆ بێ خوات کردم !!!!!!
تۆ بێ ئەوت کردم!!!!!
ئەو کاتانەی شکۆی شاهانەی من شەهادەتی ئەو،
شەهادەتی ئەو تاقانەشەهامەتی من بوو!!
ئەو کاتانەی تەنها دووڕو گەنجینەی من خوێنی ژنێتی ئەو بوو!!
حیکمەتی من سەر تەقەی ڕێگایەکی تربوو
بۆ دەرهێنانی خەنجەرو
بۆ هاوڕێیەتی تفەنگو



بۆ هێنانەوە خوێن!!!
بۆ ڕەنجی من لەبەیانی مردنی ئەودا کۆتایی هات،
بۆ کۆتایی ئەو لەکۆتایی ڕەنجی منا دەستی پێکرد !؟
قسەی شەوێکی بێزومەکە دەرگای ژوورەکەم ئەکەمەوە بەخۆم
ئەڵێم:
هەستەرەوە ئەی ئەوەی عومرت لەو دیووی دێرەکانتەوە خەوتووە،
تەماشا ژیان لەدەرەوە لەسەر پێی خۆی ئەڕوات،
ئەی ئەوەی ڕۆژگارت لەبەری دەستت کورتترە
دڵت بەبەیانیت لەگەڕووی پیاوکوژێك
بەدوا شەوی خۆی تەنگترە،
تەماشاکە مردن چۆن لەسەر ئەژنۆ
لەڕەنجی ژنێکدا ماندووە،
کە دوور لەدوێنی تۆو ڕوو لەبەیانی خۆی ڕێ ئەکات،
حەزدەکەم فرزەندم کە تۆ بیت
کە پشتت لە وەهمی منو ڕوو لەڕاستەقینەی خۆتیت!!
ئەو کاتانەی مانڤێستێ تر ئەکەمەوە کە نووسیووتە
دایکەبوون خۆی ئەم دەقەیەو دەقی تریش
(بەڵام تۆ قسەیەکت کردو هەزار قسەی ترت، هەزار قسەی ترت
دۆڕاند..)

# پێرست

نـاتوانم لـه هـەموو هەسـتێکمەوە سوپاسـی خـاتوو(شـیرین . ك)ی هـاوڕێم نەکـەم کـە زیـاتر لـە عیشـقی مـن بـۆ بەچاپ گەیانـدنی ئـەم دەقـە شـعرییانە هەوڵیـدا، مانـدووبونی خـۆی بەسـەر تەمـەنی منـەوە بـە جێهێشت، ماندووبونێك کە هەرگیز شایستەی لەبیر کردن نییە...

ژوان ئـاوارە